# ڕستەسازی و شیتەڵکاری زانستی



| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 0 | | | | | |
| 0 | +1 | | | | |
| 0 | +1 | +2 | | | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | +4 | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | +4 | +5 |

ئامادەکار
د. شێرکۆ بابان

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | 0 |
| | | | | -1 | 0 |
| | | | -2 | -1 | 0 |
| | | -3 | -2 | -1 | 0 |
| | -4 | -3 | -2 | -1 | 0 |
| -5 | -4 | -3 | -2 | -1 | 0 |

---

وانەکانی (ڕستەسازی): دکتۆرای زمانی کوردی

کۆرسی یەکەم ١٩٩٥-١٩٩٦

زانکۆی سەلاحەددین

هەولێر ١٩٩٦

# ڕستەسازی و شیتەڵکاری زانستی

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 0 | | | | | |
| 0 | +1 | | | | |
| 0 | +1 | +2 | | | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | +4 | |
| 0 | +1 | +2 | +3 | +4 | +5 |

نووسینی

د. شێرکۆ بابان

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | -1 |
| | | | -2 | -1 |
| | | -3 | -2 | -1 |
| | -4 | -3 | -2 | -1 |
| -5 | -4 | -3 | -2 | -1 |

---

**وانەکانی (ڕستەسازی): دکتۆرای زمانی کوردی**

**کۆرسی یەکەم ١٩٩٥-١٩٩٦**

**زانکۆی سەلاحەددین**

**هەولێر ١٩٩٦**

# * وته‌یه‌ك *

سه‌ره‌تای ئه‌م پرۆژه‌یه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ساڵی ١٩٧٧ كاتێك كه هه‌ستمان كرد به‌چه‌ند دیارده‌یه‌كی زانستی له زمانه‌كه‌دا. له كۆتایی ساڵانی هه‌شتادا كێشه‌كه دابین كرا و هه‌موو سه‌ره ده‌زووه‌كان دۆزرانه‌وه. بۆ پێویستی لێكۆڵینه‌وه، له‌سه‌ره‌تادا به زاری (گه‌رمیان) ده‌ست پێ‌كرا پاشان گه‌یه‌نراوه به زاری (كوێستان). له هه‌موو ئه‌و هه‌وڵانه‌دا، ئێمه ویستوومانه كه زمانه‌كه وه‌ك سیسته‌مێك سه‌یر بكه‌ین تا بتوانین ناڕێكی و ناته‌بایی له ڕێزمانه‌كه‌دا كه‌م بكه‌ینه‌وه. سه‌باره‌ت به پرۆگرامی كۆمپیوته‌ر، هه‌ر له‌یه‌كه‌م هه‌نگاوه‌وه ئه‌وه له بیردا بووه كه ڕێزمانه‌كه وه‌ربگێرین بۆ (ڕێزمان به پرۆگرام Programmable grammar ). جۆره ڕێزمانی ئاوها ده‌بێت بتوانێت ڕسته‌ی زمانه‌كه به كۆمپیوته‌ر ڕۆبنێت و پاشان بتوانێت ڕسته وه‌ربچه‌رخێنێت به هه‌موو ڕێچكه ڕێزمانی‌یه‌كان دا. ئه‌وه‌ی شایانی باسه له نێره‌دا ئه‌وه‌یه كه ته‌نها ڕێزمانی یه‌ك ڕسته‌ی ساده‌ی بێ‌ئاوه‌ڵگوزاره لێك دراوه‌ته‌وه به‌هیوای ئه‌وه‌ی كه له قۆناغێكی تردا بتوانین له ئه‌و سنووره بترازێین.

سه‌باره‌ت به زمانی نووسین ئێمه ویستوومانه به‌زمانێك بنووسین كه ئاوێنه‌ی بۆ چوونه‌كانمان بێت. هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه ده‌ستمان داگرتووه له‌ئاستی ڕه‌نگه‌سواوه‌كان و ڕه‌گه‌زه ئاودیوكراوه‌كان به‌تایبه‌تی له‌ئاستی (جێناو و

ئامرازی پەیوەندی )دا. بە واتایەکی تر ئێمە ویستوومانە کەوا کەڵك لە گۆشتەکە و لە ئێسقانەکەش دا هەبێت.

لەبەشی یەکەم و دووەم و سێیەم دا، سەرەتایەك پێشکەش کراوە چی لەسەر پڕۆژەکەو ئامانجەکانی، یان چی لەسەر بابەتی نووسینەکە. لەبەشی چوارەم دا روخساری کردار شیتەڵ کراوەتەوە و کراوە بە پلیکانەیەکی ئەندازیاری. لەبەشی پێنجەم دا، پەنامان بردووە بەر بیرکاری و چووینەتە سەر زمانی (بگۆڕ و نەگۆڕ). پاشان لە بەشی شەشەم دا گەیشتووین بە رێزمانی رستە (رستە سازی). بەشی حەوتەمیش تەرخان کراوە لە لایەکەوە بۆ بەرەنجام و کەڵکی بابەتەکە و لە لایەکی ترەوە بە شەڵ سەنگاندنی زانستی پرۆژەکە لەلایەن بەشی (ماتماتیك و زانستی کۆمپیوتەر)ەوە لە زانکۆی ئەمستردام لە هۆڵندا.

ئەوەی کە لە کۆتاییدا، شایانی دیاری کردنە ئەوەیە کەئەم نووسینە یەکەم کتێبی ئێمەیە و لەساڵی (١٩٩٣)دا نووسراوە لەگەڵ دوو کتێبی تر، یەکەمیان (رێزمانی بوون و هەبوون) و دووەمیان (رێزمانی جێناوی لکاو).

بە هیوایین خزمەتێکی بچووك پێشکەش کرابێت بەزمانە شیرینەکە و بەزمانەوانی.

د. شێرکۆ بابان

# بەشی یەکەم

## سەرەتایەك

### ١ـ مەبەستەکانی ئەم نووسینە :

ئەم نووسینەی بەردەست وەك هەموو بابەتێکی کلاسیکی ئاسایی نی‌یە. ئێمە دەمانەوێت شارەزایی‌ی خۆمان لە ئەندازەدا (هەندەسە) بەکاربهێنین بۆ رۆنانی ڕێزمانێکی زانستیانەوهاوچەرخ. لە ئەم نووسینەدا ئێمە پەنا نابەین بۆ هەموو لایەنەکانی ڕێزمان تەنها هەر سنتاکسی ڕستەی زمانەکە لێك دەدەینەوە.هەر لەبەر ئەوە بایەخ نەدراوە نە بە دەنگسازی و نە بە واتاسازی لەرووی شێتەڵ کاری‌ی زانستی‌یەوە. سەبارەت بەوشەسازی تەنها لەرێزمانی کرداردا باس کراوە، ئەویش لەبەرئەوەی پەیوەندی هەیە بە ڕستەسازی‌یەوە. بۆ نموونە بۆ کردارێك، وەك ( دەست لەئیش هەڵنەگرتن) دەبینین کەوا لەرێژەدا پارچۆلکەکانی دەبن بە جێباز بۆ جێناوی لکاو. بۆ ئەوەیە کەوا بایەخ دراوە بەروخساری کردار.

لەسەرەتای ئیش کردندا بیرمان لەئەوە کردەوە کەچۆن دەست

پێ بکەین. پاش خوێندنەوەو لێ کۆڵینەوە، زانیمان کەوا «رێزمانی کردار» بێنازە و لە رێزمانی کرداریشدا رێزمانی جێناو بێ نازترە، پاشان لە رێزمانی جێناویشدا روخسارو رەفتاری جێناو بێ نازترینە. بۆ نموونە دیاردەکانی جێگۆڕکێ مەگەر بەسەرزاری باس کرابن. لەبەر ئەم هۆیانە خۆمان هاوێشتە نێو رێزمانی کردارەوە تا گەیشتین بە رستەسازی.

پاش چەندین لێکۆڵینەوە، توانیمان بیردۆزەیەك بۆ روخساری رستە دابنێین وەك ریزێك لە خانەی ئەندازەیی، پاشان توانیمان بیر بگوشین و بیرکاری ئەو رستەیە یەکلایی بکەینەوە. پاش ئەوە پەنامان برد بۆ کۆمپیوتەر بەیاریدەی مامۆستا ( سالار خضر حسین) وانەبێژ لەکۆلێجی ئەندازە لە زانکۆی سەلاحەدین. پاش ساڵێك رەنجدان توانیمان هەموو ئەم بۆچوون، هاوچەرخانەی نێو ئەم نووسینە بکەین بەکەرەستەیەکی زیندووی وەك زێڕی خاو. لەساڵی ١٩٩٢ دا یەکەم رستەی زمانەکە بەکۆمپیوتەر دروستکرا و

هەموو شامەبەستەکانی ئەم لێکۆڵینەوە پێکرا و ئەم کردەوانە ئەنجام دران:

١- دروست کردنی رستە بۆ هەموو کرداری زمانەکە

بەکۆمپیوتەر.

٢ـ دروست کردنی ڕستە بۆ هەموو کرداوە بیژۆکەکان وەك "وتن، ویستن، هاتن، ...هتد"

٣ـ دروست کردنی ڕستە بۆ کرداری "بوون وهەبوون"

٤ـ وەرچەرخاندنی ڕستە بە پێی دەمکات بە شێوەیەکی سەربەست .

٥ـ وەرچەخاندنی رستە بـۆ:

ئەرێ ⇄ نەرێ

یەك پات ⇄ دوو پات

ئاشکرا ⇄ نیازداری

ئاشکرا ⇄ گومانداری

- - - - - - - - - - - - - - -

٦ـ هەموو دیاردەکانی وەرچەرخان، باسکراو لەخاڵی (٤،٥)دا دەتوانن یەکتری ببرن و لەیەك جودا ببنەوە و یان بەیەکەوە بەکاربهێنرێن. ئەمە وای لەپرۆگرامەکە کردووە کەوا رستەکە وەرچەرخێنێت بەهەموو لایەك دا. بەئەم پێ یە گەیشتووین بە ئامەبەستەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

پاش ئەم پێشەکییە لەسەر ئیشەکەمان دەتوانین بیر بگوشین و بڵێین ڕێزمانێك بکرێت بە پرۆگرام و وەکوو کەرەستەکی زیندوو رستە دروست بکات و وەری بچەرخێنێت بە هەموو لایەك دا بەسەربەستی، دەبێت ڕێزمانێکی زانستی بێت و هەموو بنچینە و میکانیزمەکانی بەجوانی لێکدرابێتەوە.

هەمووشمان دەزانین کەوا هەموو رستەیەکی بینراو یان بیستراو لەلایەن مرۆڤەوە پێك هێنراوە و تەنها هەرخۆی دەتوانێت وەری بچەرخێنێت. بەڵام ئێمە یەکەم رستەی زمانەکەمان بە مەکینە دروست کردوە و مەکینەش وەریدەچەرخێنێت بەهەموو لایەکدا بەسەربەستی. لەلایەکی ترەوە دەتوانین بڵێین کەوا مرۆڤ هەر لە بوونییەوە تا ئەمرۆ ئامێری مۆسیقا لێ دەدات کەچی نەیتوانیوە رستەیەکی بەکەڵك بدرکێنێت پێی.

ئێستاش سەبارەت بە ئامانجەکانی ئەم نووسینە دەتوانین ئەم خاڵانە ریزبکەین :

یەکەم - لێکدانەوە و دۆزینەوە و دەرخستنی هەموو میکانیزمە بنەڕەتییەکان و هەموو بنج و بنچینە زانستییەکان.

دووەم : هەوڵ دان بۆ یەکخستنی میکانیزمە بنەڕەتی‌یەکان، بە تایبەتی لەزارە ناوچەیی‌یەکاندا.

سێیەم : بەکارهێنانی میتۆلۆجی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە زمانانی تردا. جۆرە هەوڵی ئاوها بەکاریتی بۆ چوونەکان دەسەلمێنێت.

چوارەم : بەپێی ئەوەی باس کرا خزمەتێکی گەورە پێش کەش دەکرێت بە ڕێزمانی رستە (رستە سازی). واتە رستەی زمانەکە دەدرێت لە خشت بری زمانەوانی هاوچەرخ. ئەوەش لە یاد نەکەین کەوا رستە یەکەی واتا بەخشە چی لە گوفتاردا و چی لە زمانی نووسین دا.

پێنجەم : بەپێی پسپۆری خۆمان لە بواری ئەندازیاری دا، دەتوانین بیروبۆچوونی ئەندازەیی بەکاربهێنین لە داڕشتنی کردار و رستەدا بۆ گەیشتن بە کاروانی زانست لە بواری زمانەوانی هاوچەرخ دا. لە ئەو بوارەدا لێکۆڵینەوەی زمانەوانی لە سنووری وێژەیی ترازاوە و گەیشتووە بە سنووری ماتماتیك و زانستی کۆمپیوتەر.

شەشەم : پێش خستن و یەکخستنی ڕێنووس، بە تایبەتی ڕێنووسی کردار لە ریزی رستەدا کەوا زۆر پەرپووت و هەڕەمەکی‌یە. جۆرە لێکۆڵینەوەی ئاوها دەتوانێت روخسار و جێگای ئەندازەیی هەموو

ڕەگەزەکانی کردار دیاری بکات لە پلیکانەی ڕستەدا. بە زمانێکی تر خانەرێژ کردنی کردار و ڕستە جوانترین دیارییە بۆ ڕێنووسەکە.

حەوتەم ـ هەوڵ دان بۆ ئەوەی شتێکی نوێ بخرێتە سەر ئەو ڕێزمانەی کەوا پێش(٧٥) سال ماموستایانی نەمر و پایەبەرز تۆفیق وەهبی و سعید صدقی پێش کەشیان کردووە.

هەشتەم ـ دەرخستنی مۆرکە جوانەکان و مۆرکە تایبەتییەکانی زمانەکە، یان ئەو مۆرکانەی کەوا جودای دەکاتەوە لە زمانانی تر بەبەراوردی[٥] زانستیانە .

## ٢ـ بیرۆچکە نوێیەکانی نێو ئەم نووسینە :

لە ئاستی ئەم نووسینەدا چەند بیروڕایەك هەڵوەشانەوە و چەند بیروڕایەکی تریش هەنگاویان ناوە بۆ نێو ڕێزمانەکە، وەك:

١ـ داژەندنی پارچۆڵکەی ( ئاندن) لە کرداری تێپەڕێنراودا بۆ کۆلکە ڕەسەکانی خۆی.

٢ـ چەسپ کردنی چاوگی( ئاندن) بەتەواوی لەگەڵ چاوگی دالیی تێپەڕ، وەك : (بژاردن، ژماردن، ناردن ...).

٣ـ بەکارهێنانی دوو چاوگی تازەی بکەر نادیار، وەك : (نووسران)

و (سووتێنران) پڕ بەپڕ وەك چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ.ئەم دوو چاوگەش دچنە نێو ریزی چاوگەکانی ترەوە.

٤- پەی بردن بەڕێزمانی "بوون و هەبوون" و دەرخستنی زۆر لایەنی نادیار بۆ ئەم دوو کردارە. پاشان دیاری‌کردنی رەنگ دانەوەی ئەو رێزمانە لە رێزمانی کارە ئاسایی‌یەکاندا. ئەم بابەتە لە نووسینێکی تردا بلاو دەکرێتەوە.

٥- دانانی ئەندازە بۆ رێژەی (فەرمان) و هەڵوەشاندنەوەی ئەو بیروبۆچوونەی کەوا لەسەر دوو جۆر فەرمان بنیات نراوە. ئێمە لێرەدا بەشی (فەرمانی نا راستەوخۆ) دەدەینەوە پاڵ (داخوازی) لە رستەی نیازداری‌دا.

٦- داڕەندنی زاراوەی (ئینشائی) بۆ دوو بەشی ئاشکراوفراوان لە زمانەکەدا وەك (رستەی نیازداری) و (رستەی گومانداری)، ئەو تێکەڵ و پێکەڵی و پەروپووتی یە خانە رێژکرا و جێی کرایەوە لە زمانەکەدا.

٧- دەست داگرتن لەسەر ئەو بابەتانەی کە "بشقە" بوون لە رێزمانەکەدا وەك رێزمانی کردار، جێناوی لکاو، جێگۆڕکێ و ئەرك گۆڕکێ.

٨- پۆلین کردنی جێناوی لکاو بەرێگایەکی زۆر زۆر وردتر لە پۆلین کردنەکەی جاران. ئەم پۆلین کردنە پەی دەبات بە بارە ناهەموارەکانی جێناو بەتایبەتی جێناوی کەسی سێیەمی تاك. لەئەم رووەوە توانیومانە بنج و بنەڕەتی جێناو بدۆزینەوە وە بزانین کەوا چۆن بگەینەوە بە دوو گرووپە رەسەنەکەی جێناو بە رێگایەکی زانستیانە .

٩- پەی بردن بە دیاردەکانی وەرچەرخان لەکرداردا. پاشان هێڵی سنوور دیاری کرا لە نێوان ( دیاری و نادیاری)دا (المبني للمعلوم و المبني للمجهول) .

١٠- لەبەشەکانی داهاتوودا، پێنج دەروازە بۆ ڕستەی زمانەکە دەرخراوە کەوا لەدوو چاوگی بنجی‌یەوە چەکەرە دەکەن .ئەم پێنج دەروازەیە دەتوانن نهێنیی (دەربڕین) بەرامبەر بە هەر رووداوێك دیاری بکەنو دەبن بەبنەڕەت بۆ هەموو رستەیەکی تر. ئەم بابەتە ناو نراوە «رێزمانی بنەڕەت».

١١- دیاری کردنی رێژەکانی دەمکاتی رانەبردوو وەك : «رێژەی بنەڕەت» بۆ دەمکاتەکانی رابردوو. بەئاشکرا دەرخراوە کەوا هەموو رابردوویەك دەبێت هەموو پارچۆلکەکانی رەگی رانەبردوو هەڵ

بگرێت وەك چینی بنەڕەت. بەزمانیکی تر دەتوانین بڵێین هەموو رابردوویەك بریتی‌یە لە ڕێژەی رانەبردوو لەگەڵ بارگەی خانەکانی رابردوو بەسەر بار.

١٢- جوودا کردنەوەی (بنج و ڕەگ)، ئەویش پاش داڕشتنی ڕەگ بۆ کۆلکە سەرەتایی‌یەکانی. پاشان توانرا (بنج) دیاری بکرێت وەك خاڵی سفری ماتماتیکی، وەك یەکەم سەرەتا بۆ بیرکاری و بیرگوشین لە ڕێزمانی رستەدا. ئەم دیاردە زانستی‌یە بوو بەهۆی دانانی نەخشەی بگۆڕ ونەگۆڕ و بوو بەهۆی دۆزینەوەی سیما زانستی‌یەکانی ڕێزمانەکە.

١٣- دیاری کردنی چەند مۆرکێکی جوان و چەند مۆرکێکی رەسەن لە زمانەکەدا. بەرامبەر بەئەمە دۆزینەوەی چەند دیاردەیەکی نا هەموار لە چەشنی (ڤایرۆس) لە گوفتار و لە زمانی نووسیندا.

چەندین بابەتی تر، کەواپێویست ناکات هەموویان باس بکەین، لە بەشەکانی داهاتوودا بەرچاو دەکەون.

## ٢ـ سەرچاوە زانستیيەکانی بەردەست :

هەندێك سەرچاوە هەموو کاتێك لەبەردەستدا بوون و هەموو رۆژێك کەڵك وەرگیراوە لێیان. ئەم سەرچاوانە بە دانسقە هەڵ بژێرراون لە کتێبخانەکاندا.

سەبارەت بە وەرگرتن بەهیچ جۆرێك کەڵکی راستەوخۆ (لێوەرگرتن) وەرنەگیراوە. ئەم سەرچاوانە بە ئەم چەشنەی خوارەوە بەکار هاتوون :

یەکەم: کەڵك وەرگرتن لە هونەرو و شێوازی بیرگوشینی ئەو زانا بەرزانە لە زمانەوانی دا.

دووەم : زانینی ئاستی پێشکەوتن لە زمانەوانی دا بە تایبەتی لە ساڵانی هەشتادا.

سێ یەم: کەڵك وەرگرتن لە جۆرەکانی پۆلین کردن و ریزکردن و کورت بڕی لەزمانەوانی دا.

چوارەم: نزیك بوونەوە لە دوو زمانی پێشکەوتوو وەك ئینگلیزی و فەرەنسی کەوا لە پلەی یەکەم دان بۆ بەکارهێنان لە بوارەکانی زانست دا.

پاش دیاری کردنی ئەم کەڵکانە دەتوانین (بەکورتی) دەربارەی

ئەو سەرچاوانە بنووسین:

١. سەرچاوەی ژمارە (١) بریتی‌یە لە فەرهەنگی دوازدە هەزار کردار لە زمانی فەرەنسی دا. هەشتاو دوو خشتەی جیاواز بەکار هاتووە بۆ گەردان کردن و پۆلین کردن و هەر کردارێك دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە ئەو خشتانە، ئەم سەرچاوەیە باشترین کەرەستەیە بۆ ووشەسازی و رستەسازی لە بواری کرداردا و هەموو کاتێك دەبێت لەبەر دەست دابێت بۆ نووسین بە زمانی فەرەنسی. لەئەم سەرچاوەیەدا لاپەڕەکانی کۆتایی تەرخان کراوە بۆ رشتەیەکی زۆر بەرز و زانستیانە بۆ رێزمانی کردار. لاپەڕەکانی پاشەوەیەش تەرخان کراوە بۆ فەرهەنگی کردار و هەر کردارێك ژمارەی خشتەی دارشتنی لە بەرامبەری نووسراوە.

٢. سەرچاوەی ژمارە (٢) بریتی‌یە لە کتێبێکی بچووك و بەکەڵك بەناوی "کەرەستە"؛ واتە کەرەستەی بەکارهێنان لەزمانەوانی‌دا. ئەم سەرچاوەیە کەرەستەی کورت بڕو زانستیانە بەکاروەدێنێت لەهەموو بابەتەکانی رێزمانی فەرەنسی دا. چەندین خشتەو چەندین نیشانە و چەندین پۆلین کردنی جوان بەکارهێنراون وەك کەرەستەی زمانەوانی.

٣ـ سەرچاوەی ژمارە (٣) بریتی‌یە لە فەرهەنگێکی گەورە، "فەرەنسی: فەرەنسی". لە (٢١٧١) لاپەڕەدا باری زمانەوانی دەیان هەزار ووشە لێك دراوەتەوە. هەر ووشەیەك لەئەم فەرهەنگەدا بیری لەسەر گوشراوە بەڕادەیەك هەموو نهێنی‌یەکانی دەرخراوە. لەلاپەڕەکانی دوایی‌دا چەند پاشکۆیەکی پوختە و پاراو ریزکراوە بەپێی رێزمانی زمانی فەرەنسی .

٤ـ سەرچاوەی ژمارە (٤) بریتی‌یە لە فەرهەنگێکی( فەرەنسی ـ فەرەنسی) بچووك و پاشکۆیەکی رێزمانی فراوان هەیە تی‌ی‌دا بەناوی (کاکڵەی رێزمانی فەرەنسی). ئەم فەرهەنگە چونکە بچووکە زۆرتر کاریگەرە لە بەکارهێنان دا و زۆر کەڵك وەرگیراوە لێ‌ی.

٥ـ سەرچاوەی ژمارە (٥) بریتی‌یە لە کتێبێکی فراوان (٣٥٠) لاپەڕیە بۆ فێرکردنی زمانی ئینگلیزی بە فەرەنسی بە شێوەیەکی چەسپاو. لەئەم سەرچاوەیەدا (٣٥٥) بابەتی رێزمانی ئینگلیزی بە بەراورد لێك دراوەتەوە بە رێزمانی فەرەنسی. نووسەرانی ئەم کتێبە خاوەن بەهرەن و بەهرەی هونەری و زانستی‌یان بەکارهێناوە بۆ کورت بڕی. لە کۆتایی‌دا چواردە پاشکۆی رێزمانی بەراوردکراو "ئینگلیزی: فەرەنسی" پێشکەش کراوە. جوانترین پاشکۆ لەئەم

کتێبەدا بریتی‌یە لەپاشکۆی کێشەکانی ڕێنووسی زمانی ئینگلیزی.
٦- سەرچاوەی ژمارە (٦) بریتی‌یە لە وانەی زمانی ئینگلیزی بۆ زانکۆی تەکنۆلۆژی کۆمپیاین لە فەرەنسا. ئەم کتێبەش بە شێوەیەکی زانستی، ڕاهێنانی زمانەوانی ئینگلیزی و فەرەنسی بە بەراورد هەڵدەسەنگێنێت بۆ فێرکردنی ئینگلیزی بۆ فەرەنسی زانان.

٧- سەرچاوەی ژمارە (٧) بریتیە لە فەرهەنگی کرداری بڕگەیی، واتە کرداری داڕێژراو ولێکدراو لە زمانی ئینگلیزی دا. واتای کردارەکان بە زمانی عەرەبی لێك دراوەتەوە. لە ئەم کتێبەدا دەرخراوە کە چۆن، پارچۆلکەی وەك ئامرازی پەیوەندی یان وەك پاشگر، واتای کرداری زمان دەگۆڕن. کەڵکی ئەم سەرچاوەیە لە ئەوەدایە کەوا زمانی کوردی ئەم بەهرەیە هەیە تێی دا. واتە بە ژمارەیەکی کەم لە کرداری بنجی چەندین کرداری ناسادە دروست دەبن بە هێزی پێشگر وپاشگر.
٨- سەرچاوەی ژمارە (٨ و٩) ئەم دوو کتێبە باسی بیردۆزەی چومسکی لە ڕێزمانی وەرچەرخاودا دەکەن بەشێوەیەکی زانستی و پرکەڵك و زۆر کەڵك وەرگیراوە لە ئەم دوو سەرچاوەیە بۆ

تێگەیشتنی دیاردەکانی وەرچەرخان لە زمانەکەدا بە بەراورد لەگەڵ زمانی ئینگلیزیدا.

ئەمە بوو کورتەیەك لەسەر سەرچاوە زانستییەکانی بەردەست کەوا رۆژانە بەکارهاتوون. لەگەڵ ئەمانەدا چەندین سەرچاوەی تر بەپێی پێویست و ناو بە ناو بەکارهاتوون. لێرەدا پێویست ناکات هەموویان ریز بکەین. (بڕوانە بۆ سەرچاوە زانستییەکانی بەردەست لە کۆتایی ئەم نووسینەدا).

# بەشی دووەم
# دەروازەیەك بۆ ڕێزمانی کردار

## ١ـ پێشەکی :

پێش ئەوەی بچینە نێو ئەم بەشەوە دەتوانین ئەم گفت و گۆیەی خوارەوە ئەنجام بدەین بۆ دەرخستنی نەخشەی ئەم کتێبە. پاشان هەوڵ دەدەین بۆ بەکارهێنانی چەند زاراوەیەك کەوا پێویستن. گفت و گۆکەش بریتی‌یە لەئەم پرسیارو وەڵامانە :

ئایا لە کوێوە دەست بکەین بە زمان ؟

ـ لە ڕستەوە.

ئایا لەکوێوە تەنگ بەڕستە هەڵبچنین ؟

ـ لە کردارەوە.

ئەی لە کوێوە دەست بکەین بە ڕێزمانی کردار ؟

ـ لە ڕەگەوە.

ئەی لە کوێوە دەست بکەین بە هەڵ وەشاندنی ڕەگ ؟

ـ لە بنجەوە .

ئەی لە بنج وردتر نی‌یە ؟

- بنج بچووكترين و زيندووترين پارچۆڵكەی كرداره.

ئەمە بوو گفت و گۆيەك لەسەر داڕشتنی رستەی زمانەكە هەتا بچووكترين پارچۆڵكە كەوا دەبێت هەر هەبێت لە گوفتار دا.

ئێستاش دەست دەكەين بەباس كردنی( بنج) و بەرە بەرە روو دەكەين لە رەگ و كردارو رستە. لە كۆتايی ئەو سەردێرانەی داهاتوودا، كەپەيوەندی‌يان هەيە بە( رێزمانی كردار)ەوە، كاكڵەيەكی زانستی دياری دەكەين بۆ روخساری ئەندازەيی كردار لەزمانی كوردی‌دا.

## ٢- بنج و رەگ :

لەبۆ چوونی ئێمەدا بنج بريتی‌يە لە ئەو بەشەی چاوگی بنجی كە لە رێژەی رانەبردوودا بەكاردەهێنرێت، واتە رەگی چاوگی بنجی. زاراوەی (رەگ) زۆر فراوانترە و زۆر ئاڵۆزترە لە(بنج).

دكتۆر نەسرين فەخری و دكتۆر كوردستان موكريانی هاوكێشەيەكيان بەكارهێناوە بۆ دياری كردنی رەگ:

**چاوگ - نيشانەی چاوگ = رەگی چاوگ**

بەلام ئێمە ئەم هاوكێشەيە بەشێوەيەكی وردتر دادەرێژين بۆ چاوگی

ڕەلجی و بەم چەشنەیە:

**چاوگی بنجی ـ نیشانەی چاوگ = بنجی چاوگ**

بۆ نموونە، وەك گرتن (گر)، کەوتن (کەو)، نووسین (نووس)... . ئەوەی بنجە لە کرداردا بواری وردکردنەوەی نەماوە بەڵام ئەوەی ناونراوە ڕەگ وردکردنەوەی هەیە ، وەك :

سووتاندن ـ دن = سووتان (سووت + ێن)

نووسران ـ ان = نووسر (نووس + ر)

سووتێنران ـ ان = سووتێنر (سووت + ێن + ر)

بە ئاشکرا دیارە کە ئەو ڕەگانەی سەرەوە بریتین لە (بنج) و پارچۆڵکەی (ێن) و (ر). کەواتە ئێمە لە بنجی چاوگەوە دەست پێ دەکەین، هەر چەندە ئەو چاوگەش بنجی نەبێت. لە لایەکی ترەوە چەند پارچۆڵکەیەکی ڕەگی ڕابردوو هەیە بەهیچ جۆرێك ناچنە نێو چاوگەوە، وەك:

من ڕۆیشتبووم ...........(بوو)

بریا ئەو ڕۆیشتبا..........(با)

من ڕۆیشتووم.............(وو)

ئەگەر تۆ ناردبێتت......(بێت)

ئەو پارچۆڵکانە پەیوەندییان نییە بە چاوگەوە هەرچەندە پارچەی رەگی رابردوون. بە کورتی (بنج) پارچۆڵکەیەکە لە رەگی هەموو چاوگێك و (بنج) ئەو پارچۆڵکەیە کەوا وردکردنەوەو لەت کردن پەسند ناکات.

## ٣ـ چاوگی بنجی :

چاوگی بنجی لە رێزمانی زمانەکەدا پێناسە کراوە بە جوانی و بریتی یە لە (بنج) و (نیشانەی رابردوو) و (نوونی چاوگ) بە شێوەیەکی تر :

چاوگی بنجی = (بنج)+(نیشانەی رابردوو) + ن

وەك ، گرتن، نووسین، کەوتن، سووتان، لەرزین، خستن.....ئەم چاوگانە بریتین لە بچوکترین یان کورت ترین روخساری چاوگ .

## ٤ـ چاوگی سادە :

چاوگی سادە نەختێك لە چاوگی بنجی درێژترە و دوو پارچۆڵکەی (رەگ) هەڵ دەگرێت وەك (ێن) و (ر) بۆ نموونە :

سووتان (ێن) : (سووت)+(ێن)+(د)+(ن) = سووتاندن

نووسین (ر) : (نووس)+(ر)+(ا)+(ن) ـ نووسران

سووتان (ێن + ر) : (سووت)+(ێن)+(ر)+(ا)+(ن) ـ سووتێنران

بەئەم پێیە (سووتاندن و نووسران و سووتێنران) بریتین لە چاوگی سادە و بەهێزی پارچۆلکەی (ێن) یان (ر) یان (ین+ر) درێژ بوونەتەوە. لەزمانی کوردیدا هەموو چاوگێکی بنجی چاوگی سادەی هەیە تەنها چەند نموونەیەك نەبێت.

## ٥ـ چاوگی ناسادە :

چاوگی ناسادە بریتی‌یە لەئەو چاوگە بنجیانەی، یان ئەو چاوگە سادانەی کە پێشتر باسکران پاش درێژ بوونەوەیان بە پێشکار. ئەم پێشکارەش پارچەیەك نی‌یە لە (رەگ) بەڵکو پارچەیەکی سەربارە لە کردار، وەك :

هەڵگرتن، داکەوتن، راکردن، بەرد شکاندن.

راوەستێنران، فرێدان، پێ کوشتن.

## ٦ـ پێشکار و پێشگر :

زاراوەی پێشکار لەم نووسینەدا بۆ ئەو پارچۆلکانەی کردار بەکارهێنراون کەوا دەکەونە پێش رەگی کردارەکە، وەك:

(دە) م گرت : (دە)، پارچولکەی بەردەوامی

(نە) م دەگرت : (نە)، پارچۆلکەی نەرێ

(هەڵ) م گرت : (هەڵ)، پێشگری کردار

(لێ ) م گرت : (لێ)، ئامرازی پەیوەندی

(بەرد) م هەڵگرت : (بەرد)، بەرکار

ئەو پێنج پێشکارە دەکەونە پێش رەگی کردار و کردارەکە درێژ دەکەنەوە. پێشکاری(دە) ناچێتە چاوگەوە بەڵام لە رانەبردوو و فەرمان و رابردووی بەردەوامدا هەیە. پێشکاری (نە) گشتی‌یە بۆ هەموو رێژەکانی کردارە و بۆ چاوگ. پێشکاری (هەڵ) بریتی‌یە لە پێشگری کردار، وەك (هەڵ، دا، را، رۆ)، یان (سەر، بەر، دەر، لا، پاش، پێش، دوا) یان (فڕی، رەوانە، تووڕە).

پێشکاری (لێ) بریتی یە لە هەموو روخسارە جیاوازەکانی ئامرازی پەیوەندی وەك (لێ، تێ، پێ، بۆ). پێشکاری (بەرکار) بریتی‌یە لەئەو وشانەی کەوا دەبن بە(بەرکاری راستەوخۆ)ی رستەکە.

## ٧ـ چاوگی داڕێژراو :

بریتی‌یه له ئه‌و چاوگه ناسادانه‌ی که‌وا به پێشگری (هه‌ڵ) و هاوه‌ڵه‌كانی درێژ بوونه‌ته‌وه، وه‌ك :

| | |
|---|---|
| هه‌ڵ | گرتن، دا گرتن، را گرتن |
| سه‌ر | كه‌وتن، دا كه‌وتن، به‌ركه‌وتن |
| فـڕێ | دان، تووڕدان، هه‌ڵ دان |
| ره‌وان | كردن، رۆكردن، دروست كردن |
| ...... | ....، ......، .......... |

## ٨ـ چاوگی لێكدراو :

بریتی‌یه له ئه‌و چاوگانه‌ی كه‌وا به(به‌ركار) درێژبوونه‌ته‌وه، وه‌ك :

به‌رد شكاندن، ده‌ست گرتن، سه‌ر شۆردن.

هه‌ندێك چاوگی تر هه‌یه به بكه‌ر درێژ ده‌بنه‌وه، وه‌ك:

ناوك كه‌وتن، دڵ شكان.

## ٩ـ پاشگری دووپات کردنەوە :

پاشگری ( ەوە) دەچێتە سەر هەموو چاوگێك و هەموو ڕێژەیەکی چالاکی کردار و دەبێت بە هۆی دووبارە کردنەوەی کردەوەیەك بە گشتی بەڵام واتاش دەگۆڕیت لە زۆربەی کردارەکان دا. هەندێك کردار هەیە بێ ئەم پاشگرە واتا نابەخشێت و هەندێکی تر هەیە ئەم پاشگرە وەرناگرێت.

## ١٠ـ مەبەستی ڕستە :

ڕستەی زمانەکە لە ڕووی مەبەستەوە دەبن بە دوو خێزان :

یەکەم: ڕستەی بێ مەبەست : ئەم جۆرەڕستەیە مەبەستێکی شاراوە دەرناخات لە گوفتاردا، وەك :

١ـ ڕستەی ئاشکرا : بۆ نموونە (من دەڕوم) .

٢ـ ڕستەی فەرمان : بۆ نموونە (تۆ بڕو) .

دووەم: ڕستەی مەبەست دار : ئەم جۆرە ڕستەیە مەبەستێکی تایبەتی دەردەخەن کەوا ناخی ئەوکەسە دایە کەوا ڕستەکە پێکەوە دەنێت وەك:

١ـ ڕستەی نیاز (نیاز داری) : بۆ نموونە، (حەزم دەکرد ئەو

رۆیشتبا) ئەم جۆرە رستەیە نیازو داخوازی لە ناخی قسەکەرەوە دەردەخات .

٢ـ رستەی گومان (گومانداری) : بۆ نموونە (باوەڕ ناکەم ئەو رۆیشتبێت) ئەم جۆرە رستەیە (گومان) یان (مەرج) یان (دوو دڵی)ی ئاخێوەر دەردەخات .

ئێستاش بە جوانی ئەم چوار جۆرە رستەیە یەکالا دەکەینەوەو ئەو دەرگایانە دەکەینەوە کەوا تا ئێستا هەر بە داخراوی بەکار هاتوون.

لە رێزمانەکەدا هەرسێ جۆر رستە باس کراوە :

١ـ رستەی ئاشکرا

٢ـ رستەی ئینشائی

٣ـ رستەی فەرمان

لە رستەی ئینشائیدا نیاز وگومان تێکەڵ وپێکەڵ کراوە و بەئەو چەشنە ساڵ لە دوای ساڵ جاوراوەتەوە، بەڵام جوانترین بیر و را لەئەم روانگەیەوە مامۆستا مەسعود محەمەد دەری بڕیوە کە دەڵێت، بەرامبەر بە هەر رستەیەکی ئاشکرا رستەیەکی ئینشائی هەیە. مامۆستا درکی بە ئە وە کردووەو بەس بێ ئەوەی یەکالای بکاتەوە، بەڵام ئێمە دەڵێین بەرامبەر بە هەر رستەکی ئاشکرا رستەیەکی

نیازداری و رستەیەکی گومانداری هەیەو بە ئەم چەشنە چوار جۆر رستە دەست نیشان دەکرێت لە رووی مەبەستەوە:

١- رستەی ئاشکرا : تۆ رۆیشتیت

٢- رستەی نیازداری: خۆزگا تۆ رۆیشتبایت

٣- رستەی گومانداری : رەنگە تۆ رۆیشتبیت

٤- رستەی فەرمان : تۆ بڕۆ

رستەی ئاشکرا و فەرمان زۆر لەسەریان نووسراوە پێویست ناکات لێرەدا باس بکرێن، بەڵام رستەی نیاز و گومان زۆر بێ نازن بە رادەیەك سێ هەڵەی گەورە پەیدابووون لەزۆربەی نووسینەکان دا:

- هەڵەی یەکەم : وەك لە پێشتردا باس کرا، رستەی گومان و رستەی نیاز جودا نەکراونەتەوە و نەزانراوە کەوا زمانەکە زۆرفراوانە و چەند رستەی ئاشکرا هەیە ئەوەندەش رستەی نیاز هەیە و ئەوەندەی تریش رستەی گومان هەیە.

- هەڵەی دووەم : بەشێك لە رستەی نیازداری لە رانەبردوودا کەوا مەبەستی (داخوازی) هەڵدەگرێت دراوەتە پاڵ (رستەی فەرمان) بە هەڵە و ناو نراوە (فەرمانی ناراستەوخۆ).

- هەڵەی سێ یەم : هەندێك نموونەی لاکۆڵان کەوتوونەتە نێو

نموونەی ڕێزمانەوە، لەوانە پاشگری (ایە). ئەم ئامرازە کە بە کارهات دەبێت بەهۆی تێکەڵ وپێکەڵ بوون، وەك نموونەی (حەزم دەکرد ئەو ڕۆیشتبا)، ئیستاش ئەگەر (با)ی نیاز لابەین دەبێت بە (حەزم دەکرد ئەو بڕۆیشتایە). ڕستەی یەکەم بەرامبەر بە ڕابردووی نزیك دەوەستێت بەڵام ڕستەی دووەم بەرامبەر بە ڕابردووی بەردەوام دەوەستێت.

## ١١- شێوازی نیازداری :

لە زمانەکەدا هەموو ڕستەیەکی ئاشکرا لە دۆخی ڕانەبردوو و ڕابردوودا ڕستەیەکی نیازداری هەیە لە بەرامبەری. هەموو ڕستەیەك لە ئەم جۆرە پەیوەستە بە هیواداری یەك، یان نیازداری یەك، یان داخوازی یەك لە ناخی بەکارهێنەری ڕستەکەوە.

ڕستەی نیازداری وەك لە ڕووی مەبەستەوە سەربەست نی یە لە ڕووی داڕشتنیشەوە سەربەست نی یە، هەموو کاتێك کەرەستەیەکی ڕێزمانی هەیە، وەك ئامرازێك یان ڕستەیەك بۆ دەربڕینی نیازە نهێنی یەکە. ئەو ئامرازانەی کەوا بەکاردێن ئەمانەن (با، دەبا، نەبا) یان (خۆزگا، بریا، ...). وەك :

با ئێمە بڕۆین : ئێمە دەڕۆین

نەبا ئەو بڕوات : ئەو دەڕوات

دەبا ئەوان بڕۆن : ئەوان دەڕۆن

لەئەم نموونانەدا کەوا رانەبردوون تەنها پێشکاری بەردەوامی (دە) روخساری گۆڕا بۆ(ب). ئەم میکانیزمە بەسەر کرداری تێپەڕ وکرداری تێنەپەڕ دەچەسپێت. لە رابردوودا میکانیزمەکە نەختێك ئالۆزترە، وەك:

- رابردووی نزیك :

با ئێمە ڕۆیشتباین : ئێمە ڕۆیشتین

بائێمە نارد بامان : ئێمە ناردمان

- رابردەوی بەردەوام:

بائەوان بڕۆیشتبان : ئەوان دەڕۆیشتن

با ئێوە بتان ناردبا: ئێوە دەتان نارد

- رابردووی دوور :

با منڕۆیشتبووبام : من ڕۆیشتبووم

با تۆ ناردبووبات : تۆ ناردبووت

لە ئەم رستانەداپارچۆلکەی (با) هاتە ناوەوە جێی خۆی کردەوە

له هەموو رستەکانی نیازداریدا، بۆ کرداری تێپەڕ وتێنەپەڕ.

هەروەها پێشکاری (دە) لە رابردووی بەردەوامیش دا بوو بە (ب).

لە زۆر جێدا لە رستەی دووەمی پاشکەوتوودا نیازداری دەردەکەوێت.

لە ئەو نموونانەدا رستەی یەکەم بە ئاشکرا نیاز و داخوازی و هیوادەخوازێت و رستەی دووەم مچورکی (نیاز) هەڵدەگریت بەناوەڕۆکەکەی ؛ وەك :

(تۆ حەز دەکەیت) کەوائێمە بڕۆین : بەرامبەر بە (ئێمە دەڕۆین)

یان :

(تۆ حەزت دەکرد) کەوا ئێمە ڕۆیشتباین : بەرامبەربە (ئێمەڕۆیشتین).

یان :

(تۆ حەزت دەکرد) کەوا ئێمە بڕۆیشتباین : بەرامبەر بە( ئێمە دەڕۆیشتین).

لێرەدا وادەردەکەوێت ئەگەر دوو رستە کەوتە پاڵی یەکتری و رستەی یەکەم نیازی هەڵگرت و نێوانی هەردوو رستەکە بە ئامرازی (کەوا) یان (کە) پڕکرایەوە ئەوا رستەی دووەم دەبێت بە

(نیازداری). ئەمە ئەوە بیردەخاتەوە کە زۆر پارچەی رستە لەکوڵاندا سواوەو زمانی نووسین پێویستە ئەو پارچە سواوانە بەکاربهێنێتەوە.

## ١٢ـ شێوازی گوماندارى :

لە داڕشتنی شێوازی نیازداریدا، وترا کەوا بەرامبەر بەهەر رستەیەکی ئاشکرا رستەیەکی نیازداری هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا دەست دادەگرین و دەڵێین (بەرامبەر بەهەر رستەیەکی ئاشکرا، لە رابردوو و رانەبردوودا، رستەیەکی نیازداری و رستەیەکی گوماندارى هەیە).هەموو رستەیەکی گوماندارى نیگەرانییەك، یان دوودڵییەك، یان هەڵو مەرجێك، یان گومانێك هەڵ دەگرێت لەناخی ئەو کەسەدا کەوا رستەکە بەکاردەهێنێت.بۆ ئەم شێوازەش چەند کەرەستەیەك هەیە وەك(رەنگە، لەوانەیە ، ئەگە ر، مەگەر،.....، هتد).

لە رانەبردوودا شێوازی گوماندارى پڕ بە پڕ یەکسان و هاوڕوخسارە بە شێوازی نیازداری. ئەم یەکسانییە لە روخساردا بووە بەهۆی تەمو مژ و شەوکوێری لە ئەم رووبەرە فراوانەی زمانەکەدا. شێوازی گوماندارى زۆر جاریش لە رستەی دووەمی پاشکەوتوودا دروست دەبێت. رستەی یەکەم بەئاشکرا گومان و نیگەرانی

دەردەخات و رستەی دووەم مچورکی (گومان) هەڵ دەگرێت بە ناوەرۆکەکەی، وەك:

تۆ حەز دەکەیت کەوا شیرین نەڕوات : (شیرین ناڕوات)

تۆ گومان دەکەیت کەوا ئێمە بخەوین:(ئێمە دەخەوین)

لە رابردوودا (گومانداری) زۆر لە (نیازداری) جودا دەبێتەوە :

یەکەم: بۆ کرداری تێنەپەڕ :

لەوانەیە، کەوا ئەوان ڕۆیشتبن : (ئەوان رۆیشتن)

رەنگە ئێمە نووسرابین : (ئێمە نووسراین)

دووەم: بۆ کردار تێپەڕ:

لەوانەیە، ئەوان ناردبێتیان : (ئەوان ناردیان)

ئێوە میوەکەتان خواردبێت : (ئێوە میوەکەتان خوارد).

وەك : لەزمانی لاکۆلاندا، دەمکاتی رابردووی بەردەوام خۆی چەسپاندووە و بووە بە نوێنەری هەموو جۆرەکانی تری رابردوو، بۆ رستەی نیاز، بەلام لەشێوازی گومانداریدا، وا دەردەکەوێت کەوا رابردووی تەواو برەوی زۆرتر بێت و بووبێت بە نوێنەری هەموو رابردووەکان.

## ١٣ـ دەمکاتی ڕستە :

ئێمە هیچ ڕەخنەیەك ناگرین لە ئەو کاتانەی کەوا بۆ ڕستەی زمانەکە دیاری کراون، ئێمەش لە ئەم نووسینەدا پیادەیان دەکەین. بە کورتی سێ جۆر ڕستە هەیە لەرووی کاتەوە :

١ـ ڕانەبردوو

٢ـ ڕابردوو

٣ـ فەرمان

دەمکاتی ڕابردوو بە تەنیا چوار جۆری هەیە:

١ـ ڕابردووی نزیك، (من ڕۆیشتم)

٢ـ ڕابردووی بەردەوام، (من دەڕۆیشتم)

٣ـ ڕابردووی دوور، (من ڕۆیشتبووم)

٤ـ ڕابردووی تەواو، (من ڕۆیشتووم)

لێرەدا پێویست ناکات زۆرتر لەسەر ئەم لایەنەی ڕێزمانەکە بڕۆین و ئەم دابەش کردنە خۆی چەسپاندووە لە ڕێزمانەکەدا.

## ١٤ـ بکەری ڕستە :

لەرستەی زمانەکەدا یەك بکەری ڕسەن هەیە و ئەو بکەرەش دوو ڕوخساری هەیە. یەکەم ڕوخسار بریتی‌یە لە بکەری جودا(نەلکاو) و دووەم ڕوخسار بریتی‌یە لە (بکەری لکاو). وەك :

(من) دەڕۆ(م)

(ئێمە) نان دەخۆ(ین)

(ئەوان) نامە(یان) نارد( ــ )

لەئەم ڕستانەدا (من، ئێمە، ئەوان) بکەری جودان بەڵام (م،ین ، یان) بکەری لکاون. بکەری جودا چەندین جۆری هەیەو بەرفراوانەو زۆر باس‌کراوە پێویست ناکات زیاتر لەسەری بڕۆین. ئەم بکەرە دەتوانێت بە ئاسانی ڕستەکە بەجێ بهێلێت. بکەری لکاو بەردی بناغەی ڕستەیە و بەتەنیا واتا نابەخشێت بەلکاویش ڕستە بەجێ ناهێلێت و هەموو کاتێك نوێنەری زیندووی بکەری جوودایە لە ڕستەدا. بابەتی بکەری لکاو بریتی‌یە لە (م، یت، ێت، ین، ن، ن) بۆ کرداری تێنەپەڕ و دەمکاتی ڕانەبردوو، یان بریتی‌یە لە (م، ت، ی، مان، تان، یان) بۆ کرداری تێپەڕ لە ڕابردوودا. بۆ ڕیژەی فەرمان بریتی‌یە لە (ە، ن) بۆ هەموو کردارەکان. سەبارەت بە بکەری

رسته بەگشتی لە زمانەکەدا، یەك راستی‌یەك هەیە و دەیەنەینە نێو چوارچێوە :

(لە هەموو رستەیەك دا بکەری جودا و بکەری لکاو هەیە. بکەری جودا دەتوانیت هەبێت یان نەبێت بەلاّم بکەری لکاو هەیە و هەر زیندووە و نوێنەری بکەری نەلکاوە بەکەس و بەژمارە. تەنهابۆ رابردووی‌کرداری تێنەپەڕ نەبێت کەوا بکەری لکاو نادیارە و ئەمەش ناوەڕۆکی ئەم راستی‌یە بەراویتە ناکات) .

## ١٥ـ بەرکاری رستە :

لە رستەی زمانەکەدا یەك بەرکاری راستەوخۆ دەتوانێت هەبێت لەرستەیەك دا و ئەو بەرکارەش بە دوو روخسار دەرکەوێت.

ـ یەکەم روخسار بریتی‌یە لە بەرکاری لکاو، وەك:

من (نان) دەخۆم

من دە(ی) خۆم

ئەوان (گەشت) دەکەن

من هەڵم دەگرت(ن)

بەپێچەوانەی بکەری رستەوە، بەرکاری رستە ناتوانێت بە روخساری جوداو روخساری لەیەك رستەدا دەرکەوێت. رستەتەنها

یەکێك لە ئەو دوو روخسارە دەگرێتە نێو ئامێز. سەبارەت بەبەرکاری رستە بە گشتی لەزمانەکەدا، دەتوانین ئەم راستی‌یە بخەینە نێو چوار چێوە :

(بەرکاری رستە تەنها لە کرداری تێپەڕدا دەردەکەوێت، ئەویش یان بە روخساری نەلکاو یان بەروخساری لکاو. روخساری لکاوی بەرکار نوێنەری زیندووی بەرکاری جوودایە لە رستەدا بە کەس و ژمارە، ئەویش کاتێك کەوا بەرکاری جوودا نەبێت لە رستەکەدا. تەنها بۆ کەسی سێیەمی تاك لە رابردوودا بەرکاری لکاودەبێت بە نادیار و ئەمەش ناوەڕۆکی ئەم راستیە پەراویتە ناکات).

## ١٦ـ بەرکاری نا راستەوخـۆ

بەرکاری ناڕاستەوخۆ بریتی‌یە لە بارگەی ئامرازی پەیوەندی. ئەم بەرکارەش وەك بەرکاری راستەوخۆ دەتوانێت یان بە روخساری لکاو (جێناوی لکاو) یان بە روخساری جودا (بڕگەی ناو)بێت. بەرکاری نا راستەوخۆ دەتوانێت لە رستەدا دوو جێگا بکات بە لانەی جێگای یەکەم پێش رەگی کردار، وەك:

من نامەکە (بەتۆ) دەدەم، (نەلکاو)

یان من نامەکەت (پێ) دەدەم، (لکاو)

جێگای دووەم دەکەوێتە پاش رەگ ودەرەوەی سنووری کردار، وەك:

من نامەکە دەدەم بە ئەو،(نەلکاو)

من نامەکە دە دەم پێی،(لکاو)

ئەم بەرکارە یەکێکە لە سەرچاوە گەورەکانی ئاڵۆزی لە زمانەکەدا.

# بەشی سێ یەم
# جێناوی لکاو و ئامرازی پەیوەندی

## ١ ـ سەرەتایەك بۆ جێناو :

ئەگەر ئێمە نەبین بە لایەنگری (پۆلین کردنی جێناو بۆ دوو گرووپ) وەکو لەنێو رێزمانەکەدا باوە، دەتوانین جێناوی لکاو پۆلین بکەین بە پێی ئەو ووشانەی کەوا دەلکێن پێیانەوە. بە ئەم پێیە دەتوانین دوو کۆمەڵە جێناو دیاری بکەین :

یەکەم : ئەو جێناوانەی کەوا دەلکێن بە کردارەوە.

دووەم : ئەوجێناوانەی کەوا دەلکێن بە شتی ترەوە کەواکردار نی‌یە.

ئەوانەی کەوا دەلکێن بە کردارەوە، دەبێت دوو جۆر بن بەپێی ئەو راستی‌یەی کەوا کار لەزمانەکەدا دوو جۆرن، تێپەڕ و تێنەپەڕ. لێرەدا خشتەی (١) بریتی یە لە ئەلبومی ئەو جێناوانەی کەوا دەلکێن بە کاری تێنەپەڕەوە وەك تێنەپەڕی بنجی‌وتێنەپەری بکەرنادیار بەڵام خشتەی (٢) بریتی‌یە لە ئەلبومی ئەوجێناوانەی‌کەوا دەلکێن بە کاری تێپەڕەوە، وەك تێپەری بنجی و تێپەرێنراو بە(ئاندن). لەخشتەی (٢) دا وا بەدی دەکرێت کەوا

شێوە ئاخاوتنی گەرمیان پیادە کراوە بەڵام لەبەر ئەوەی تەنها لە دەمکاتی رابردوو دا شێوە ئاخاوتنی گەرمیان و کوێستان لە یەکتری دەترازێن بە جێناوی لکاو بە جوانمان زانی کەوا خشتەی (٣) تەرخان بکرێت بۆ بەراوردکردنی روخساری جێناو لە ئەو دوو جۆرە ئاخاوتنەدا. لەئەوێدا ئاشکرا دیارە کەوا جیاوازیەکی تەواو هەیە لە جێناوی بەرکاردا. لە ئەم جێناوانەدا خشتەی (١،٢،٣) هەموو ستوونە جێناوێك لە چەشنی (م، یت، ێت، ین، ن، ن) کپ و جێ نەگۆڕن لەسەر جێگای رەسەنی خۆیان لەسەر رەگی کردارەکە بەڵام هەموو ستوونە جێناوێك لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان، یان)، سرك وجێگۆڕن مەگەر هەلومەرجێکی زۆر ورد و تایبەتی بتوانێت جێگیریان بکات لەسەر رەگی کارەکە. ئەو سێ خشتە جێناوە ئەرکی(بکەر) و(بەرکار) دادەپۆشن لە هەموو زمانەکەدا و دەگەن بە هەموو نموونەیەك، تەنها کرداری (بوون هەبوون)نەبێت کەوا لێرەدا باس ناکرێت وهەڵ دەگیرێت بۆ نووسینێکی تایبەتی.

ئێستاش سەبارەت بە ئەو جێناوانەی کەوا دەلکێن بەشتی ترەوە کەوا (کار) نییە وەك (ناو) و(ئامرازی پەیوەندی)...، دەتوانین بڵێین ئەم جێناوانە تەواوکەرن چونکە ناتوانن بەسەربەخویی ببن بە بکەر یان بەرکار لەڕستەدا بەڵام دەتوانن ببن بە تەواوکەری بکەر

وبەرکار و یان تەواوکەری ئامرازی پەیوەندی (خشتەی٤) :

(باوك «ت») هات.

یان(باوك «ت»)دەبینم.

یان(ئەو «یان») ناڕوات .

لە نموونەی یەکەمدا (ت) تەواوکەری بکەرە و لە دووەمدا تەواوکەری بەرکارو لەسێ یەمدا تەواوکەری بکەر کەوا جێناوێکی جوودایە. لە ئەم سێ نموونەیەدا ئەگەر بارگەی کەوانەکان کران بە جێناوی لکاو ئەوا هیچ بایەخێك دانانرێت بۆ جێناوە تەواوکەرەکان وەك :

ئەو هات، یان، هات .

ئەو دەبینم، یان، دە(ی) بینم .

ئەو ناڕوات، یان، ناڕوات .

ئەم جێناوانە بە جێناوی خاوەنێتی ناو براون. سەرەڕای ئەرکی خاوەنێتی دەتوانن ئەرکێکی تر پیادە بکەن کەوا بریتی یە لە ئەرکی ناڕاستەوخۆیی لە رووداوی نێو ڕستەدا. لەئەم ئەرکەدا دەلکێن بەئامرازی پەیوەندییەوە، وەك :

من نامەم نارد (بۆ«ت»)

ئەرکی ئەم جۆرە جێناوە لکاوە بە(بەرکاری ناڕاستەوخۆ) ناو

براوه له ڕێزمانی نووسراودا. لەلایەکی ترەوە ریزەجێناوی تەواوکەر له زمانەکەدا لە هەل ومەرجێکی زۆر تەسك دا جێ گۆڕکێ و ئەرك گۆڕکێ بەرپا دەکەن بەڵام ئەویش لەسەر ئاوازەی جێناوەکانی سەر خشتەی (١،٢،٣) .

## ٢- جێ گۆڕکێ وئەرك گۆڕکێ :

دوور لەروخسار و نزیك لە رەفتار دەتوانین دوو رەفتاری گرنگ بۆ جێناوی لکاو بخەینە روو، یەکەمیان (جێ گۆڕکێ) و دووەمیان (ئەرك گۆڕکێ). ئەم دوو دیاردەیە دەری دەخەن کەوا چاو خەڵەتاوە بە روخساری جێناو و زۆر کەس وا تێ گەیشتوون کەوا ئەوەی بۆ جێناو کراوە کۆتایی ڕێگایە هەرچەندە دیاردەی جێ گورکێ ودیاردەی ئەرك گورکێ دوو بابەتی بێ خزمەتن لە ریزمانەکەدا. ئێستاش دەتوانین ئەم دوو دیاردەیە پێناسەبکەین :

- یەکەم - دیاردەی جێ گۆڕکێ : ئەم دیاردەیە بریتی یە لە بازدانی جێناوی لکاو بەسەر پلیکانەی پێشکارەکانی کرداردا. کاتێك کەوا جێناو بێ چالاکی جێ گۆڕکێ برو دەلکێت بە رەگی کردارەوە و کاتێك کەوا چالاك بوو یەکەم پێشکار دەکات بەجێباز. رووکاری ئەم دیاردەیە لە بنەپەوە بۆ ڕاستە

یان لە کۆتایی رستەوە بەرەو سەرەتای رستە. ئەم رەفتارە رەفتاری هەندیک لە ستوونەکانی جێناوە. لەجێ گۆڕکێدا روخساری جێناوی لکاو ناگۆڕێت .

- دووەم - ئەرك گۆڕکێ : ئەم دیاردەیە بریتی یە لە پاشەکشێی جێناوی لکاوی بەرکار لە راستەوە بۆ چەپ، یان لەسەرەتای رستەوە بەرەو کۆتایی رستە لە ئەم دیاردەیەدا جێناوەکە کەوابەرکارە روخسار دەگۆڕێت بۆ بکەری رابردوو لە کرداری تێنەپەڕدا. لە ئەم میکانزمەدا ئەرکی بکەر دەگۆڕێت بۆ بەرکار.

ئەم دوو دیاردەیە لە بەشەکانی داهاتوودا دەخرێنە بەر رۆشنایی لێکۆڵینەوە و لێرەش دا دەتوانین لەسەر نموونەیەك دەریان بخەین:

گەرمیان : من «هەڵ» (یان) (م) «دە» «گرت» (-) (-)

کوێستان : من«هەڵ» (-) (م) «دە» «گرت» (-) (ن)

لە رستەی یەکەمدا بەرکارو بکەری لکاو جێگۆڕکێ دەکەن بەڵام لە رستەی دووەم دا بەرکاری لکاو دەگەڕێتەوەو روخسار دەگۆڕێت. بە پێی ناوچەش رستەی یەکەم لە ئاخاوتنی گەرمیاندا دەردەکەوێت و رستەی دووەم لە ئاخاوتنی کوێستان (سلێمانی)دا دەردەکەوێت.

## ٣- ئامرازی پەیوەندی بنجی :

لە سەرانسەری زمانی نووسینی ئێستادا، چاوی ئێمە تەنها سێ ئامرازی پەیوەندی بنجی وتەلکاو دەبینێت، ئەویش :

«بە» ، «لە» ، «بۆ»

ئامرازی «بۆ» تەنها یەك روخساری نەلکاوی هەیە کەچی ئامرازی«بە» و ئامرازی «لە»، هەر یەکەی سێ روخساری جیاوازیان هەیە، وەك :

«بە ـــ»، «بە ـــ دا»، «بە ـــ ەوە»

«لە ـــ»، «لە ـــ دا»، «لە ـــ ەوە»

بەئەم پێیە تەنها حەوت ئامرازی پەیوەندی جوودا هەیەو لەم ئامرازانە، سیانیان یەك پارچەیی و سادەیە، «بە، لە، بۆ» و چواریان دوو پارچەیی و ئاوێتەیە، «بە ـــ دا، لە ـــ دا، بە ـــ ەوە، لە ـــ ەوە».

پاش دیاری کردنی حەوت روخساری جوودا بۆ ئامرازی پەیوەندی بنجی نەلکاو، دەتوانین روو بکەین لەشێوەی لکاوی ئەم ئامرازانە، ئەمەش ئەو روخسارە لکاوانەیە :

بە ـــ ـــ ← پێ ـــ ـــ

بە ـــ دا ← پێ ـــ دا

بە ـــ ەوە ← پێ ـــ ەوە

له — — ———➜ لێ — —

له — دا ———➜ لێ — دا

له — ەوە ———➜ لێ — ەوە

بۆ — — ———➜ بۆ — —

لێرەدا شەش ئامراز روخساریان گۆڕا به لکاوی و تەنها هەر ئامرازی (بۆ) روخساری خۆی دەپارێزێت .

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بپرسین :

ئایا چی کاتێك ئامرازی جوودا دەبێت به ئامرازی لکاو ؟

له وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین تەنها کەرەستەی جێناوی لکاوی تەواوکەر بۆی هەیە ئەم ئەرکە بەجێ بهێنێت له رستەدا، واته له رێژە چالاکەکانی کرداردا، یان له چالاکی گوفتاردا ئەم دیاردەیە روو دەدات. ئەویش له کاتێکدا کەوا برگەی پەیوەندیدار (بارگەی هێله ئاسۆییەکان له ئامرازەکان دا) لادەبرێت وە به ئامرازێکی لکاوی تەواکەر جێگیر دەکرێت، وەك :

من «نامەکەم»(م) «به ئازاد دا» «دە» (نارد)

من «نامەکەم»(م) «به ئازادی کوڕی مامت دا» «دە»(نارد)

له شێوەی ئامرازی لکاودا ئەم دوو نموونەیه دەبن به :

من(نامەکە) «م»(پێ «ی» دا)(دە) (نارد)

زۆر جار ئەو جێناوە(ی)، جێ گۆرکێ دەکات، وەك :

(من) «نامەکە»(ی) «پێ» (-) دا» «دە» «نێر» (م)

هەندێك جار جێناوی تەواوکەری (ی) دەبێت بە(نادیار)، وەك :

(من) «نامەکە»(م) «پێ(-) دا» (دە) (نارد) (-)

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستی‌یە، کەوا جێناوی تەواوکەری کەسی سێیەمی تاك لە دەمکاتی رابردوودا و لە خانەی ئامرازدا، دەتوانێت (دیار) بێت یان (نادیار). زۆر جار ئامرازی پەیوەندی لکاو بەئەو ناوانەوە دەلکێن کەوا لە کردارەوە هاتوون بەلاّم چالاّکی‌یان مەییوە و جێناوەکەش نادیارە، وەك :

پێ ـــ کردن، پێ ـــ دوە کردن، پێ ـــ دا کردن

یان وەك :

سەر لێ ـــ شێواو، لێ-کەوتوو

پێ ـــ گر، پێ ـــ نووس، پێ ـــ وە نووس

ئەمە بوو روخساری لکاوی ئامرازی پەیوەندی بەلاّم واش دەردەکەوێت کەوا ئەمە کۆتایی رێگاکە نەبێت، چونکە هەندێك ئامراز دوو روخساری لکاویان هەیە، وەك ئامرازی «لە»، خشتەی (٥). شێوەی لکاوی دووەمی ئەم ئامرازانە بەرامبەر بە ئامرازی داڕێژراو دەوەستن ، وەك :

له ناو — ← تێ — —

له ناو دا ← تێ — دا

له ناو ەوە ← تێ — ەوە

سەرەڕای ئەو ئامرازانەی کەوا باس کران، ئامرازێکی تر هەیە بە ڕوخساری ( ە). ئەم کەرەستەیە ڕوخساری زۆر شل و شاوە دەتوانێت جێی ئامرازەکانی تر بگرێتەوە، وەك :

دەچم بۆ دەرەوە ← دەچمە دەرەوە

دام بە ئەو ← دامە ئەو

هەندێك لەنووسەران درکیان بەئەمە کردووە، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە :

- یەکەم : ئەم کەرەستەیە لە جێیەکدا پتەو دەبێت ئەگەر بکەوێتە پێش ئاوەڵکاری شوێن وەك :

(سەر، دەر، ناو، بەر، ژێر، ژوور، .....هتد ). یان ئەگەر بکەوێتە پێش چاوگی کردارێك .

- دووەم : ئەم کەرەستەیە ڕوخساری لکاوی نییە بەڵام ئەگەر هەیبوو ئەوە باشترین بەڵگەیە کەوا ڕەسەنییە. لەئەم هەلومەرجەدا ڕوخسارە لکاوەکە ڕستە ڕەسەنەکە دەدۆزێتەوە، وەك :

من نامەکە دەدەمە شیلان ←── من نامەکە دەدەم پێی

واتە ئامرازەکە بریتی‌یە لە(بە) و دەبا لەرەسەندا بنووسرابا:

من نامەکە دەدەم بە شیلان.

- سێیەم : ئەو رستەیەی کەوا خاڵی دووەم نەچەسپا بەسەری‌دا، بێ گومان ئەوا ئاوەڵکارەکەی کرتاوە دەبێت بدۆزرێتەوە، وەك:

دەچێتە گیرفانەوە ←── دەچێتە ناو گیرفانەوە

ئێستاش دەتوانین هەموو ئامرازەکان لەیەك خشتەدا کۆبکەینەوە، (خشتەی ٦). لەئەم خشتەیەدا ئامرازی لکاوی(لێ - دا) سڕرایەوە چونکە ئامرازی لکاوی(تێ - دا) خۆی سەپاندووە بەسەر گوفتاردا و(لێ - دا) هەر لەناوچووە. ئەوەی شایانی باسە ئەم دوو ئامرازە هەردوویان واتای (لەناودا) دەبەخشن، بەلاَم(لێ -) و(لێ - ەوە) واتای (تێ -) و(تێ - ەوە) نابەخشن،هەر بۆ ئەوەیە زیندوون و ماون لەگوفتاری رۆژانەدا. ئەمەبوو ئەلبوومی ئامرازی پەیوەندی بە کورتی و بەپێی پێویستی ئەم نووسینە، بەلاَم ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلْ و گەلاَڵە کراوە و لەکاتی خۆی‌دا بلاَو دەکرێتەوە.

| جیناوی جودا | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | - | م | - | - | - |
| تۆ | یت | - | یت | - | ە | - |
| ئەو | ێت | - | - | - | - | - |
| ئێمە | ین | - | ین | - | - | - |
| ئێوە | ن | - | ن | - | ن | - |
| ئەوان | ن | - | ن | - | - | - |

**خشتەی -١- : جیناوی لکاو، کاری تێنەپەڕ**

| جیناوی جودا | رانەبردوو | | رابردوو | | فەرمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| م | م | م | م | م | - | م |
| تۆ | یت | ت | ت | ت | ـە | - |
| ئەو | ێت | ی | ی | - | - | ی |
| ئێمە | ین | مان | مان | مان | - | مان |
| ئێوە | ن | تان | تان | تان | ن | - |
| ئەوان | ن | یان | یان | یان | - | - |

**خشتەی ٢ : جیناوی لکاو ، کاری تێپەڕ - گەرمیان**

| جێناوی جودا | گەرمیان | | کوێستان | |
|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| من | م | م | م | م |
| تۆ | ت | ت | ت | بت |
| ئەو | ی | - | ی | - |
| ئێمە | مان | مان | مان | ین |
| ئێوە | تان | تان | تان | ن |
| ئەوان | یان | یان | یان | ن |

خشتەی (٣) : بوراوردکردنی جێناو لە شێوە

ئاخاوتنی گەرمیان و کوێستان دا

دەمکاتی رابردوو ، کاری تێپەڕ

| جوودا | لکاو |
|---|---|
| من | م |
| تۆ | ت |
| ئەو | ی |
| ئێمە | مان |
| ئێوە | تان |
| ئەوان | یان |

خشتەی ٤

جێناوی تەواوکەر

| شێوەی نە لکاو | شێوەی لکاوی یەکەم | شێوەی لکاوی دووەم |
|---|---|---|
| لە ــــــ | لێ ــــــ | تێ ــــــ |
| لە ــــــ دا | ~~لێ ــــــ دا~~ | تێ ــــــ دا |
| لە ــــــ ەوە | لێ ــــــ ەوە | تێ ــــــ ەوە |

**خشتەی ٥**

| شێوەی جودا | شێوەی لکاوی یەکەم | شێوەی لکاوی دووەم |
|---|---|---|
| بە ــــ ــــ | پێ ــــ ــــ | ــــــــــ |
| بە ــــــ دا | پێ ــــــ دا | ــــــــــ |
| بە ــــــ ەوە | پێ ــــــ ەوە | ــــــــــ |
| لە ــــــ | لێ ــــ ــــ | تێ ــــ ــــ |
| لە ــــــ دا | | تێ ــــــ دا |
| لە ــــــ ەوە | لێ ــــــ ەوە | تێ ــــــ ەوە |
| بۆ ــــــ | بۆ ــــــ | ــــــــــ |
| لەسەر ــــ ــــ | ــــــــــ | ــــــــــ |
| لەسەر ــــ ەوە | ــــــــــ | ــــــــــ |

**خشتەی ٦**

## ئامرازی پەیوەندی بنجی

# بەشی چوارەم
# پلیکانەی کردار

## ١- پێشەکی:

بیرۆچکەی ئەم لێکۆڵینەوە لە ئەو راستییەوە وەرگیراوە کەوا (کردار) یەك روخساری نییە بەڵام لەهەر روخسارێك دا یەك درێژییەکی هەیە. واتە بۆ یەك (کردار) چەندین درێژیی جیاواز هەیە. ئەم راستییە لە فیزیکی کرداردا لەئەو راستییە دەچێت کەوا (ئەگەر کۆمەڵێك شیش هەبیت بە پێوانی هەمەجۆر لە گۆڕەپانێك دا، هەر یەکێك دەتوانێت ببێت بە ئەندازیار و بیرۆچکەیەکی ئەندازەیی دابڕێژێت بۆ پۆلین کردنی شیشەکان. بۆ نموونە ئەو شیشانە کۆ بکەینەوە کەوا تەنها هەر بەدرێژی لە یەکتر جیاوازن. پاشان دەتوانین ئەم کۆمەڵە جودا کرایەوەیە بەپێی درێژیەکانیان ریز بکەین لە کورتەوە بۆ درێژتر و بۆ درێژتر ..... تا درێژترین، یان بەپێچەوانەوە. ئەم پۆلین کردنە ریزایەتییەکی (ئەندازەیی) دەبەخشێت بەچاوی بینەر ئەگەر شیشەکان هەر هەموویان تەریب بوون بۆ یەکەم شیش و هەر هەموویان ستوون بوون لەسەر زەمینەیەکی

ئاسۆیی. لەئەم ریزکردنەدا جیاوازی درێژایی هەر شیشێك دەبێت بە «پلە» بۆ دراوسێکەی و هەموو پلەکان لە ریزدا بەیەکەوە دەبن بە پلیکانەیەکی ئەندازەیی).

بە ئەم چاوی سەرنجە وەك ئەندازیارێك روومان کرد لە روخساری (کردار) لە زمانەکەدا. پاش هیلاك بوونێکی دوور ودرێژ توانیمان کەوا جێ‌پێی خۆمان بکەینەوە لە کرداری (گرتن) دا و لەدەمکاتی رابردوودا. کورت ترین روخساری(گرتن) بریتی‌یە لە رابردووی نزیك وەك:(گرت) «م». پاش درێژ کردنەوەی ئەم کردارە توانیمان بگەین بە راستی‌یەك، ئەویش تەنها (دە)ی بە ردەوامی لە رابردووی بەردەوامدا دەتوانێت درێژی بکاتەوە، وەك :

(دە) «م» (گرت)

لێرەدا (نە) «م»(گرت) و(هەڵ) «م»(گرت) و(لێ) «م»(گرت) هەرچەندە بەپلەی درێژی وەك(دە) «م»(گرت) هەمان درێژیی‌یان هەیە بەڵام درێژیی‌یەکانیان رەسەن نی‌یە چونکە درێژتر دەبنەوە. بۆ نموونە (هەڵ) «م»(گرت) دەتوانێت ببێت بە:

(هەڵ) «م»(نە)(دە) گرت

جا لەبەر ئەوە(دە) «م»(گرت) بوو بە دراوسێی کورت ترین

روخسار،(گرت) دەمە. بەڵام چەشنە رستەی:

(نە) دەمە(دە)(گرت)

بوو بەپلەی دوواتر، پاشان رستەی:

(هەڵ) دەمە(نە)(دە)(گرت)

بوو بەپلەی دوواتر، پاشان رستەی:

(بۆ) دەمە(هەڵ)(نە)(دە)(گرت)

بوو بەپلەی دوواتر، پاشان رستەی:

(نامەکە) دەمە(بۆ)(هەڵ)(نە)(دە)(گرت)

بوو بە درێژترین پلە .

لێرەدا شەش درێژییی پلەیی دەست نیشان کرا. ئێستاش دەتوانین بیر بکوشین و بڵێین:

١ـ هەر رستەیەك پڕ بە پڕ پڕکراوەتەوە و لۆچی لێ براوە.

٢ـ هەر رستەیەك ژمارەی ئەو خانە بۆشانەی پێشان داوە کەوا لەناخی دا دیار نین.

بۆ نموونە پلەی (دە) دەمە(گرت) ناتوانێت بە هیچ جۆرێك جێی خانەیەکی ناوەندی بکاتەوە لەنێوان خانەی (دە) و خانەی (گرت) دا، بەڵام (نە) ی (گرت) دەتوانێت جێگای

خانەی (دە) بکاتەوە بە ناوەندەکەی و دەبێت بە (نە) ەم؛(دە)(گرت). لێرەدا بە ئاشکرا (نە) ەم؛(گرت) خانەیەکی ناوەندی هەبوو لەناخیدا و ئەمەش ئەوە دەردەخات کەوا رستەکە هەرچەندە بەروخساری (نە) ەم؛(گرت) دەربکەوێت لە گوفتار و لەنووسین دا بەلآم لەناخی بیردا بەئەم روخسارە تۆمار کراوە:

(نە) ەم؛(-)(گرت)

بە ئەم چەشنە رستەی (نامەکە) ەم؛(گرت) چوار خانەی ناوەندی هەڵ دەگرێت لە کتێبخانەی بیردا، وەك (نامەکە) ەم؛(-)(-)(-)(-)(گرت) هەر خانەیەك بارگەی رەسەنی خۆی هەیەو ئەو بارگەیە خاوەنی خانەی خۆیەتی. لێرەدا دەتوانین بڵێین (بیر) رێگای داوە بە (زمان) کەوا رستەکە کورت بکاتەوە لە گوفتاردا ئەگەر خانەیەك بێ بارگەبوو، ئەوەش بەمەرجێك ئەگەر بارگەکە هاتەوە، دەبێت خانەکەی بدرێتەوە پێی. ئێستاش دەتوانین بگەڕێینەوە سەر پلەکان و ریزیان بکەین وەك شیشەکان کەوا باس کران بەلآم ئەمان لەسەر باری ئاسۆیی نەك ستوونی.

ئەو شەش روخسارە جیاوازە بۆ کرداری (گرتن) لە

رابردوودا، کەوا شەش درێژیی پلە جیاوازیان هەیە دیاردەیەکی زانستیانەی بەرز و جوان دەبەخشن لە ریزی ئەندازەییدا، بۆ نموونە ئەگەر درێژترین رستە کرا بەچینی ئاسۆیی ژێرەوە پاشان پلە پلە بەرەو کورتی رۆیشتین، دەبینین کەوا پلیکانەیەك دروست دەبێت (وێنەی ١). لە ئەم پلیکانەیەدا ئەگەر دوو خانەی هاوبارگە خرانە سەر یەك لە دوو چینی جیادا ئەوا هەموو خانە هاوبارگەکان دەکەونە سەر یەکتر، وەك:

(نامەکە) دەم(بۆ تۆ)(هەڵ)    (نە)(دە)(گرت)
|      |      |      |      |      |
(هەڵ) دەم(نە)(دە)(گرت)

لێرەدا هەرچوار خانەکەی رستە کورتەکە چووە بەرامبەر هەر چوار خانە هاوبارگەکە لە رستە درێژەکەدا. بەم چەشنە دەبینین کەوا پلیکانەکە دەبێت بە شەش ستوونی جیاواز بەبەرزیی بۆ شەش بارگەی دیاریکراو، واتە هەر ستوونێك یەك بارگەی هەیە. بەئەم پێیە شەش ستوونەکە بە (بەرزیی) و بە (بارگە) لەیەکتری جیاوازن. ئەم دیاردەیە لە ئەوە دەچێت کەوا ئەدرشیشانەی لە نموونەکەدا باسکران هەر یەکێك لەرەنگێك بێت و جۆری رەنگەکانیش پلەیی بێت. ئەم دوو جیاوازییە

زانستی و پلەیی‌یە دەبن بەبیرکاری زمانەوانی و یەکەم هەنگاوی لێکۆلینەوەکە دەست پێ دەکات.

## ٢ـ پلیکانەی پێشکاری کردار:

لەوێنەی «١» دا پلیکانەیەکی ئەندازەیی و شەش چینی پەیدابوو، کەوادەبێت بە بنەمایەکی زانستی بو رێزمانەکە. تەنها مەرنج لەئەم پلیکانەیەدا ئەوەیە کەوا لەخانەی ئامرازدا (بۆتۆ) بەکارهات، چونکە ئەگەر (بۆت) بەکارهات،ئەو جیناوە لکاوە دەواوکەرە و لەسەردێری نووسینەکە دەردەچین. ئەم پلیکانەیە بەم جەشنە ئەم کەلکانەی خوارەوە دەبەخشێت بە زمانەکە:

کەلکی یەکەم : هەر چینێك لە پلیکانەکە پلەی ئالۆزی پاری دەکات بە ئەم چەشنە:

پلەی سفر : یەك پارچەیی، وەك:

(گرت) «م»

پلەی یەکەم : دوو پارچەیی، وەك:

(دە) «م»(گرت)

پلەی دووەم : سێ پارچەیی، وەك:

(نە) ‹م›(دە)(گرت)

پلەی سێیەم : چوار پارچەیی، وەك:

(هەڵ) ‹م›(نە)(دە)(گرت)

پلەی چوارەم : پێنج پارچەیی، وەك:

(بۆ تۆ) ‹م›(هەڵ)(نە)(دە)(گرت)

پلەی پێنجەم : شەش خانەیی، وەك:

(نامەکە) ‹م›(بۆتۆ)(هەڵ)(نە)(دە)(گرت)

ـ کەڵکی دووەم : دیاری کردنی جێگای ئەندازەیی بۆ هەموو پارچەکانی کردار بە شێوەیەکی زانستی و یەکلایی کراوە. ئەو پێشکارانە ئەگەر پێش و پاش کەوتن ئەوا زمانەکە دەبزڕکێت .

ـ کەڵکی سێیەم : ئەم پلیکانەیە خانەکانی پێشکار دەخاتە بەر شیتەڵ کردنەوەی زانستیانە، وەك:

١ـ خانەی (دە) : بەردەوامی لەرستەدا پەیدا دەکات. لە رابردووی (نزیك و دوور و تەواو) دا ئەم خانەیە بێ بارگەیە. ئەگەر رستەکە مەبەستی (نیاز و گومان و فەرمان)ی هەڵ گرت یان نائاشکرا بوو ئەوا بارگەکەی دەبێت بە (ب).

٢ـ خانەی (نە) : گیانی (نەرێ) دەکاتە بەری رستەکە. بارگە ئەم

خانەیە هەموو کاتێك (نە) یە. ئەم بارگەیە لە رانەبردوو فەرماندا

ئاوێتە دەبێت لەگەڵ بارگە خانەی (بەردەوامی)دا، بە ئەم چەشنە :

لەدەمکاتی رانەبردوودا:

(نە) +(دە) ـــ(نا) : رستەی ئاشکرا

(نە) +(ب) ـــ(نە) : رستەی نا ئاشکرا

لەفەرمان دا :

(نە)+(بـ ) ـــ (مە) : رستەی فەرمان

٣ـ خانەی (هەڵ) : یان خانەی (پێشگر)، بارگەی ئەم خانەیە هەمە جۆرە وەك (هەڵ، دا، را، رۆ) یان وەك (بەر، سەر، دەر، پێش، دووا، وەر، لا،...). ئەم خانەیە دەرگاکەی کراوەیە بۆ چەندین لێکۆڵینەوە.

٤ـ خانەی (ئامراز) : یان خانەی ئامرازی پەیوەندی.ئەم خانەیە دەرگا دەکاتەوە بۆ ئامرازی پەیوەندی وبۆ گیانی (ناڕاستەوخۆیی) لە رستە دا.

٥ـ خانەی (بەرکار) : ئەم خانەیەش دەرگا دەکاتەوە بۆ چەندین لێکۆڵینەوە. بارگەی ئەم خانەیە هەمە جۆرە و بەڵام ئاڵۆزترین جۆری ئەو کاتەیە کەوا بەرکار جێناوی

تەواکەر هەڵ بگرێت.

- کەڵکی چوارەم : خانەکانی ستوونە هاوروخسارەکانی ئەو پلیکانەیە دەبێت بە کەرەستەی زانستی بۆ دۆزینەوەو دەرخستنی هەموو پارچە و پارچۆلکە و گەردیلەکانی ڕستە و دیاری کردنی روخساری فیزیاوی ئەو کەرەستانە .

- کەڵکی پێنجەم : دابین کردن و دەرخستنی میکانیزمەکانی (جێ گۆڕکێ) و (ئەرک گۆڕکێ)ی جێناوی لکاو.

- کەڵکی شەشەم : دۆزینەوەی چەند فایروسێك لە زمانەکەدا، کەوەکوو (مۆرانە) جەستەی زمانەکە دەخۆن. ئەو فایرۆسانە ڕەگ و هۆی پەیدابوونیان یەکلایی بۆتەوە و چارەسەریش دیاری کراوە بۆیان. لە داهاتوودائەم بابەتەش دەخەینە بەردەست لە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆدا .

- کەڵکی حەوتەم : ئەم پلیکانەیە بوو بە هۆی دۆزینەوەی سەرە دەزووی زۆر بابەتی ڕێزمانی ئاڵۆسکاو، وەك (پلیکانەی ڕەگی کردار) و (پلیکانەی کردار) کەوا لەبەشەکانی تری ئەم نووسینەدا باس دەکرێن.

## ٣ـ یاسای هێزی پێشکار :

یەکێك لە کەڵکە گەورەکانی پلیکانەی پێشکار بریتی یە لە یاسای هێزی پێشکار. ئەم یاسایە بریتی یە لە چینی ژێرەوەی پلیکانەکە کە دەتوانێت بارگەی هەموو خانەکان هەڵ بگرێت، وەك:

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| (نامەکە) | دەم | (بۆ تۆ) | (هەڵ) | (نە) | (دە) | (گرت) |
| (بەرکار) | ٤ـ٥ | (ئامراز) | (پێشگر) | (نەرێ) | (بەردەوامی) | (ڕەگ) |
| (٥) | ٤ـ٥ | (٤) | (٣) | (٢) | (١) | (سفر) |

بەپێ ی ئەم خانانە وەك ژمارەکانیان جێگای دیاری کراوی خۆیان هەیە هەریەك بەپێ ی، هێزەکە ی خۆی، کەوا ژمارەکەی دیاری دەکات، جێی خۆی دەکاتەوە لە گوفتاردا ، هێزی ئەم خانانە دیاری دەکرێت بەپێی نزیکی‌یان لە ژمارە سفرەوە :

هێزی یەکەم (بەهێزترین ) : خانەی پێشکاری(بەردەوامی)

هێزی دووەم (بە هێزتر) : خانەی پێشکاری (نەرێ)

هێزی سێیەم (بەهێز) : خانەی پێشکاری (پێشگر)

هێزی چوارەم (بێ هێز) : خانەی ئامرازی پەیوەندی (ئامراز)

هێزی پێنجەم (بێ هێز تر) : خانەی پێشکاری (بەرکار)

تەنها سەرنج لە ئەو یاسایەدا ئەوەیە کەوا خانەی چوارەم دەتوانێت هەموو پروپارچەی بارگەکەی بگوێزێتەوە بۆ پاشەوەی رستە بەبێ ئەوەی لە واتای رستەکە بگۆڕێت .

هێزی پێشکار : هەموو پێشکارێك خانەی خۆی هەیە لە کۆمپیوتەری بیردا، ئەویش بە پێی هێزەکەی کاتێك (بە هێز) لاچوو (بێ هێز) دەچێت بۆ جێگاکەی و کاتێك کە هاتەوە جێگاکە چۆل دەکرێت بۆی. ئەمەش خۆی لە خۆی دا ئەوە دەگەیەنێت کەوا زمانەکە رەفتاری ئیلاستیکی هەیە لە گوفتاردا، چونکە کردارەکان بە هێزی پێشکار درێژ دەبنەوە و بێ ئەو هێزە کورت دەبنەوە. پێوەری ئەو هێزەش بریتی یە لە ژمارەی چینەکانی ئەو پێشکارە لە پلیکانەکەدا.

ئاوێتە بوونی پێشکار : وەکو لە پێشتردا باس کرا، ئاوێتە بوون دەبێت بە هۆی کەم کردنەوەی ژمارەی خانەکان، ئەم ئاوێتەبوونە لەنێوان خانەی (نە) وخانەی (دە)دا بەئەم چەشنە رەنگ دە داتەوە لە یاسای هێزی پێشکاردا .

لە رانەبردوو دا : درێژترین روخساری یاساکە، بریتی یە لە :

وەك :

(٥) (٤) (٣) (٢ + ١) (ڕەگ)

(نامەکە) (بۆ تۆ) (هەڵ) (نا) (گر) ەمە

لە رابردوودا : درێژترین روخساری یاساکە ، بر یتی یە لە :

وەك :

(٥) (٤) (٣) (٢) (١) (ڕەگ)

( نامەکە) ەمە ( بۆ تۆ) ( هەڵ) ( نە) ( دە) ( گرت)

لەفەرمان دا : درێژترین ڕوخساری یاسا کە، بریتی یە لە :

وەك :

(٥) (٤) (٣) (٢ + ١) (ڕەگ)

(نامەکە) (بۆ ئەو) (هەڵ) (مە) (گر) ەوە

بە ئاشکرا دیارە کەوا ژمارەی خانەکانی رانەبردوو و فەرمان کەم بۆتەوە بۆ پێنج خانەو تەنها لە رابردووی بەردەوامدا روخساری شەش خانەیی دەپارێزرێت .

پێوانە و ئەندازە : یاسای هێزی پێشکار وەکو ئەندازە بەکاردێت بۆ یەك لایی کردنەوەی پارچۆلکەکانی کردارو رستە لە رووی

ڕێزمانەوە . بۆ نموونە چاووگی (بەردان) یان چاووگی (بەر بەردان)، سێ ئاڵۆزی هەڵ دەگرێت، وەك :

١ـ ڕوخساری (بەردان) لە چاووگێکی بنجی دەچێت.

٢ـ دوو جار ووشەی (بەر) بەکار هاتووە.

٣ـ جێگای ئەندازەیی ئەو پارچانە چۆن دیاری بکەین لە ڕستەدا، وەك :

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| (بەر) | دە | (لە ئاوەکە) | (بەر) | (نە) | (دە) | (دا) |
| (٥) | دە | (٤) | (٣) | (٢) | (١) | (ڕەگ) |

بەئاشکرا دەرکەوت (بەر)ی یەکەم (بەکار)ە و (بەری) دووەم (پێشگر)ە وەك (هەڵ)، یان (دان) چاوگی بنجی‌یە بۆ کردارێکی تێپەڕ. خانەی (٤) هەر دوو پێشکاری(بەر) ی پاڵ نا بۆ سەر جێگاکانیان بەپێی ڕێزمان. خانەی (١) وخانەی (٢)، چاوگی (دان) و پێشگری (بەر) یان پاڵ نا بۆ نێو کورسی‌یەکانی بەپێی هێزەکانیان. لەئەو نموونەیەدا جێگای ئەندازەیی و ناسنامەی ڕێزمانی هەرسێ پارچەکە دۆزرانەوە. دوا ووتە لەئەم بەشەدا ئەوەیە کەوا بەکارهێنانی یاساکە بەشێوەی (رابردووی بەردەوام) جوانترین ئەنجام دەدات بەدەستەوە، چونکە هەموو خانەکانی پڕ دەبن و ئاوێتە

ڕوونیش نی‌یه. بەڵام ئەوەی پیادەکردنی ئەم یاسایە ئاڵۆز دەکات بریتی‌یە لە هەبوونی جێناوی تەواوکەر لە خانەی (٥) و (٤) دا. لەئەم ڕوانگەیەوە، بەکارهێنەری ئەم کەرەستانە دەبێت بتوانێت جێناوی ئەرکدار و تەواوکەر لە یەکتر جودابکاتەوە لە ڕووی ڕێزمانەوە.

## ٤ـ پلیکانەی ڕەگی کردار:

پاش ئەوەی لە بەکارهێنانی کردارێکی تێپەڕدا جێی خانەکانی پلیکانەی پێشکار کرایەوە و ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە لای چەپی (ڕەگ) وەک لای ڕاستی یەکلایی بکرێتەوە و خانەڕێژ بکرێت. پاش چەندین نموونە و پاش بیرگۆشین توانیمان خۆ بگەیەنین بە کردارێکی تێنەپەڕ وەك (سووتان). نەشمان توانی هەر بە (گرتن) ی تێپەڕ بگەیەین بە ئەو ئامانجە چونکە کرداری تێپەڕ چاوگی (ئاندن) دروست ناکات و لەپلیکانەدا خانەیەکی چۆڵە. هەر لەسەر ئەم داڕژەندنە توانیمان کۆڵکە خۆبەشەکان هەڵبەستینەوە و پلیکانەکە دروست بکەین، پاشان سیمای فیزیاوی و ماتماتیکی لە ڕیزەکان و لەچینەکانی‌دا دەربخەین. ئەوەی لێرەدا شایانی باسە

تێکڕای پلیکانەی رەگی کردار لە خانەیەکی رەگی پلیکانەی پێشکاردا (وێنەی ١ ) جێی دەبێتەوە. لەم پلیکانەیەشدا هەمان نموونەی شیشەکان، باس‌کراو لە پێشتردا، بەکارهاتووە بەڵام ئەمجارەیان بەلای چەپدا. هەر لەبەر ئەمە نەمان ویست دووبارەی بکەینەوە چونکە ئەم پلیکانەیە پڕ بە پڕ لە پلیکانەی پێشکار دەچێت و تەنها ئەوە نەبێت کەوا راست و چەپن یان ( کەم و کۆ)ن، (+ و −)، یان سارد و گەرمن بە رادەی خانەی بنجی کردارەکە.

ئێستاش دەتوانین ئەوەی باس کرا پیادەی بکەین لە هەڵبەستنی پلیکانەی روخساری رەگدا و بیر بگوشین و رێگا نەدەین کەوا هەڵەیەك هەڵومەرجی ماتماتیکی و فیزیاوی واتە سیمای ئەندازەیی پلیکانەکە لەنگ بکات. خوێنەریش دەتوانێت بەبەکارهێنانی رەنگ نیگاری پلیکانەکە بکێشێت. بۆ نموونە رەنگی سوور بۆ پارچوڵکەی (بنج) و رەنگی زەرد بۆ پارچۆڵکە (ێن) ...هتد.

ئەگەر سەرنج لە پلیکانەی پێشکار بدەین دەبینین کردار بەپێشکار بەرەو لای ڕاست درێژ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر خانەی

(ڕەگ) لەئەو پلیکانەدا وەربگرین دەبینین ئەویش دەبێت بە پلیکانە بەلای چەپدا. بۆ نموونە چاوگی بنجی تێنەپەڕ (سووتان) بەئەم پلانە درێژ دەبێتەوە.

پلەی سفر: یەك خانەیی، وەك:

دە [سووت] (ێت)

پلەی یەکەم: دوو خانەیی، وەك:

دە [سووت] [ێن](ێت)

پلەی دووەم: سێ خانەیی، وەك:

دە [سووت] [ێن] [ر](ێت)

پلەی سێیەم: چوار خانەیی، وەك:

دە [سووت] [ێن] [ر] [ا]( ـ)

پلەی چوارەم: پێنج خانەیی، وەك:

[سووت] [ێن] [ر] [ا] [بوو] (ـ)

پلەی پێنجەم: شەش خانەیی، وەك:

حەزم دەکرد کەوا،[سووت] [ێن] [ر] [ا] [بوو] [با]

یەك گرتن و یەك خستنی ئەم شەش پلەیە دەبێت بە هۆی دروست کردنی پلیکانەیەکی ئەندازەیی رێك و پێك بۆ سەرجەمی ڕەگی

کردار له زمانه‌که‌دا : ( وێنه‌ی ٢ )

به‌پێی ئه‌م پلیکانه‌یه، چینی ژێره‌وه، که‌وا هه‌موو بارگه‌کان هه‌ڵ ده‌گرێت، ده‌بێت به یاسای درێژ بوونه‌وه‌ی روخساری ره‌گ، وه‌ك :

[ره‌گ] = [بنج] [ێن] [ر] [را. نزیك] [را. دوور] [مه‌به‌ست]

له ئه‌و هاوکێشه‌یه‌دا، بێ جگه له (بنج)، بارگه‌ی هه‌ر پێنج خانه‌که‌ی تر بریتین له ' ره‌گه‌زی ورد ' یان ' ره‌گه‌زی ناسك ' له ره‌گدا. ئه‌م بارگه ناسکانه، نه سه‌ر به‌خۆن و نه واتا دارن، به‌ڵام ئه‌رکه رێزمانی‌یه‌کان زۆر گه‌وره‌ن. ئه‌و ره‌گه‌زه ناسکانه، هه‌رچه‌نده روخساریان له ته‌ك که‌ره‌سته‌ی رێزمانی تردا یه‌کسان بێت، نابێت چاو بخه‌ڵه‌تێت له ئاستیان چونکه له جێی ئه‌ندازه‌یی خۆیاندا نه‌بن، له پلیکانه‌ی ره‌گدا، هه‌و نین. بۆ نموونه پیته‌کانی (ا، د، ت، ی، و) له سه‌رانسه‌ری زمانه‌که‌دا هه‌ن به‌ڵام کاتێك که بوون به بارگه‌ی خانه‌ی (رابردووی نزیك)، ئه‌وسا هه‌ون.

بارگەی خانەکان :

١ـ خانەی [بنج] : بریتییە لە بنجی چاوگی بنجی پاش فڕێدانی پیتی رابردوو و نموونی چاوگ وەك لەم یاسایەدا دەردەکەوێت:

چاوگی بنجی = بنج + پیتی رابردوو+ ن

٢ـ خانەی [ێن] : خانەی تێپەڕاندنی کرداری تێنەپەڕ بۆ کرداری تێپەڕ، یان (چاوگی ئاندن) .

٣ـ خانەی [ر] : خانەی بکەر نادیاری بۆ کرداری تێپەڕ و تێپەڕێنراو بە (ئاندن) .

٤ـ خانەی [نزیك] : خانەی رابردووی نزیك کەوا تەنها ئەم پێنج پیتە دەتوانێت هەڵبگرێت (أ،ت،د،و،ی).

٥ـ خانەی [دوور] : خانەی رابردووی دوور تەنها یەکێك لە ئەم دوو بارگەیە هەڵدەگرێت،[بوو]بۆ رابردووی دوور، یان [و]بۆ رابردووی تەواو .

٦ـ خانەی [مەبەست] : تەنها لە رابردوو دا هەیە و دوو بارگەی هەیە بو رستەی نا ئاشکرا، [با] بۆ مەبەستی نیازداری و داخوازی، یان [بێت] بۆ مەبەستی گومانداری

# ڕستە سازی و شیتەڵکاریی زانستی

[illegible]

د. شێرکۆ بابان

دوودڵی لە ڕستەدا .

## -کـەڵکەکانی پلیکانەی ڕەگ :

. کەڵکی یەکەم: هەر چینێك لە پلیکانەکە پلەی ئاڵۆزی ڕەگی کردار دیاری دەکات بە پێی ژمارەی کەوانەکان :

پلەی بێ ئاڵۆزی: یەك خانەیی ،[سووت ]

پلەی یەکەم لە ئاڵۆزی: دوو خانەیی، وەك :

[سووت] +(ێن)

پلەی دووەم لە ئاڵۆزی: سێ خانەیی ، وەك :

[سووت] + [ێن] + (ر)

پلەی سێیەم لە ئاڵۆزی: چوار خانەیی ، وەك:

[سووت] + [ێن] + [ر] + (ا)

پلەی چوارەم لە ئاڵۆزی: پێنج خانەیی ، وەك:

[سووت] + [ێن] + [ر] + [ا] +( بوو)

پلەی پێنجەم لە ئاڵۆزی: شەش خانەیی ،وەك:

[سووت] + [ێن] + [ر] + [ا] + (بوو)+(با)

وا دەردەکەوێت کەوا درێژترین (ڕەگ) یان ئاڵۆزترین (ڕەگ)

ڕەگی کرداری تێنەپەڕی تێپەڕێنراوە بە (ئاندن)، لە رابردووی دووردا ولە رستەی نائاشکرا دا. بۆ نموونە دەتوانین پلەی ئالۆزی ئەم کردارانە دیاری بکەین:

من (گر)(ت)(م) : پلەی یەکەم

من (سووت)(ان)(د)(م) : پلەی دووەم

من (خەو)(ت)(م): پلەی یەکەم

من (نێر)(ر)(ا)(بوو)(م) : پلەی سێیەم

من (چ)(وو)(بوو)(بێت)(م): پلەی سێیەم

- <u>کەڵکی دووەم</u> : دیاری کردن و دابین کردنی جێگای ئەندازەیی بۆ هەموو پارچۆلکەکانی ڕەگ بە شێوەیەکی بن بڕ و یەکلایی کراوە. هەر جێگۆڕینێك دەبێت بە هۆی بزڕکان و بەراویتەبوونی واتای رستەکە.

- <u>کەڵکی سێیەم</u> : ڕەگی یەك خانەیی هەر لە (بنج) دا دەردەکەوێت ئەم خانەیە گرنگترین پارچۆلکەی کردارە چونکە لە پلیکانەی پێشکاردا ڕەگ نەمر بوو و لە پلیکانەی (ڕەگ)دا (بنج) نەمر و زیندووە. ڕەگی کردار بەپێی بارگەی خانەکانی دەیان روخسار دەگۆڕێت بەڵام (بنج) هەر دیار و ئامادەیە لە رستەکەدا.

. کەڵکی چوارەم: شیتەڵکردنەوەو ساخ کردنەوەی هەیکەلی چاوگی (ئاندن) کە بریتی‌یە لە :

چاوگی ئاندن =(بنج)+(ێن)+(پیتی ڕابردوو «د»)+(نوونی چاوگ)

لەگوفتاردا (سووتێندن) دەبێت بە (سووتاندن). ئەمەش دیاردەیەکی ئاسایی‌یە کەوا (ێ) ڕوخسار بگۆڕێت بۆ (ا) لە چاوگە والی‌یە تێپەڕەکاندا، وەك (ژماردن: ژماردم: دەژمێرم)، یان (بژاردن: بژاردم: دەبژێرم)، یان (ناردن: ناردم: دەنێرم)، یان (سووتاندن: سووتاندم: دەسووتێنم)، یان (کەواندن: کەواندم: دەکەوێنم). ئەمە بوو سەرگوزشتەی چاوگی (ئاندن)، ئەمەش ئەو بیروڕایە هەڵدەوەشێنێتەوە کەوا (ئاند) بەیەك پارچە دادەنێت بۆ نیشانەی ڕابردوو، کەچی واش نی‌یە.

. کەڵکی پێنجەم : تەخت کردنی ڕێگا بۆ دیاری کردنی دوو چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ، وەك :

(سووت)+(ێن)+(ر)+(ا)+(ن)

(نووس)+(ر)+(ا)+(ن)

ئەم دوو چاوگە بایەخ پێنەدراون لە زمانەکەدا کەچی پڕ بەپڕ لە چاوگی بنجی تێنەپەڕی ئەلفی دەچن، وەك (سووتان، لەوان،

شکان). ئەم دوو چاوگەش (ێ)یە ڕووداوی وەردەگرن، وەك :

(دە)(سووت)(ێ)(م)

(دە)(سووت)(ێن)(ر)(ێ)(م).

لەمەش ئەو بیرو ڕایە لادەبات کەوا (رێ) بۆ ڕانەبردوو و (را) بۆ ڕابردوو دادەنێت، کەچی:

رێ : دەبێت بە : (ر)+(ێ)، (نیشانەی بکەر نادیاری)+(ەی ڕووداو)

را : دەبێت بە : (ر)+(ا)، (نیشانەی بکەر نادیاری)+(ئەلفی ڕابردوو)

کەڵکی سێیەم : پلێتکانەکە دابەش دەکرێت بۆ سێ ناوچە وەك دیاری کراوە لەسەر وێنەی (٣).

ناوچەی ڕانەبردوو : ئەم ناوچەیە بۆ ڕستەی ڕانەبردوو وفەرمان (أمر) بەکاردەهێنرێت بەسەربەخۆیی. ئەم ناوچەیە خۆی لە خۆیدا دەبێت بە دوو ناوچەی تر، وەك : (وێنەی ٤)

ناوچەی هاوبەش : ئەم ناوچە خۆی ڕانەبردووە بەڵام یەك دەگرێت لەگەڵ ناوچەی ڕابردوو بۆ بنیات نانی ڕستەی ڕابردوو. ئەم ناوچەیە دەتوانرێت ناو بنرێت (ناوچەی بنەڕەت).

ناوچەی رابردوو : ئەم ناوچەیە هیچ واتایەك نابەخشێت بەبێ ناوچەی هاوبەش و ئەم ناوچەیە بێ خانەی رابردووی نزیك ناتوانێت دروست ببێت. ئەمە ئەو راستی‌یە دەگەیەنێت کەوا (ناوچەی هاوبەش) بریتی‌یە لە (ناوچەی بنەڕەت) لە زمانەکەدا.

- کەڵکی حەوتەم : کورد ووتەنی (گوێز بە ژمارە مایەی دیارە) و لە کۆتایی سەدەی بیستەمیش‌دا هەموو شتێك بە ژمارە مایەی دیارە. ئەم پلیکانەیە زمانەکە دەخاتە بەر ئامێری ژمارە و ئێستا هەموو روخسارو بارە لوواوەکانی کردار دەشێت بەژمارە دیاری بکرێت. ئەم پلیکانەیە کردار شیتەڵ دەکاتەوە هەتا کۆلکە خۆبەشەکان.

- کەڵکی هەشتەم : ئەم پلیکانەیە نە جێ گۆرکێی خانەکان رێ دەدات و نەئاوێتەبوونی خانەکان و نەرێگاش دەدات هیچ پارچۆلکە و گەردیلەی نامۆ، بترنجێتە نێوانی خانەکان. ئەمە جوانترین رەفتاری زانستی‌یە و دەبێت بە هۆی یەکلایی کردنەوەی زۆربەی تەمو مژە رێزمانی‌یەکان.

- کەڵکی نۆیەم : ستوونی (ێن) و ستوونی (ر) دەتوانن ببن بە ناوچەی گونجاندن (وێنەی ٥) بۆ گونجاندنی کرداری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ بە (ێن) و گونجاندنی کردار تێپەڕ و تێپەڕێنراو بۆ

تێنەپەڕی بکەر نادیار. تەنها ئەم ناوچەیە بۆی هەیە کەوا هێزی تێپەڕین بگۆڕێت لە کرداردا بەپێی خشتەی (١،٢) بۆ وەرگرتنی جێناوی لکاوی ئەرکدار. لە هەر رستەیەکدا (ێن) هەبوو ئەوا تێپەڕە و لەهەر رستەیەکدا (ێن) و (ر) نەبوون ئەوا هێزی تێپەڕین بەپێی خانەی (بنج) دیاری دەکرێت.

- کەڵکی دەیەم : ورد بوونەوە لە کەڵکی شەشەم و کەڵکی نۆیەم، ئەوە دەردەخات کەوا ناوچەی رانەبردوو بریتی‌یە لە بنەڕەتی زمانەکە. ئەم ناوچەیە ناوچەی هاوبەش دروست دەکات و پاشان ناوچەی هاوبەش لەگەل ناوچەی رابردوودا دەمکاتی رابردوو دروست دەکات. هەر لە ناوچەی رابردوودا هێزی تێپەڕین دابین دەکرێت و رستەی تێپەڕ و تێنەپەڕی کەڵک دار بە سەربەخۆیی رۆ دەنرێت. ئەوەش لەبیر نەکەین وەکوو ئاشکراشە کە هەموو رێژەیەکی رابردوو لەسەر بنج و بنەڕەتی رێژەی رانەبردوو دامەزراوە. ئەم راستی‌یە جلەوی بیرگوشین راست دەکاتەوە ئەو نهێنی‌یە دەدات بە دەستەوە کەوا نەزانراوە و یەکەم هەنگاوی بیرکاری‌یە لە رێزماندا. ئەوەی زیاتر هەستی ئەندازیاری دەبزوێنێت ئەوەیە، بنەڕەتی رانەبردوو کەوا

یەك دەمكاتی هەیە، دەتوانێت چوار دەمكاتی رابردوو هەڵبگرێت لەچینی یەكەمدا.

## ٦ـ یاساكانی هێزی رەگ :

چینی ژێرەوەی پلیكانەی رەگ بریتییە لە یاسای هێزی پارچۆلكەكانی رەگ. ئەم چینە درێژترین چینە و هەموو بارگەی خانەكان هەڵدەگرێت:

(بنج)+(ێن)+(ر)+(نزیك)+(دوور)+(مەبەست)

(سفر) (-١) (-٢) (-٣) (-٤) (-٥)

ئەو ژمارانەی نێو خانەكان نیشانەی كەم (-) هەڵ دەگرن چونكە لە ژێرسفرەوەدا ریزكراون. ئەو ژمارانە ناتوانن پێش و دووا بكەن. هەر یەكێك لە ئەوان بە پێی هێزەكەی، جێی خۆی دەكاتەوە لە زنجیرەی هاتنیدا. لێرەشدا دەتوانین بەپێی دووری و نزیكی لە بنجەوە هێزی هەر پارچۆلكەیەك دیاری بكەین:

هێزی یەكەم (بەهێزترین): خانەی پارچۆلكەی(ێن)

هێزی دووەم (بە هێزتر): خانەی بكەرنادیاری(ر)

هێزی سێیەم (بەهێز): خانەی رابردووی نزیك(نزیك)

هێزی چوارەم (<u>بێهێز</u>): خانەی رابردووی(دوور)

هێزی پێنجەم (<u>بێ هێز تر</u>): خانەی گومان ونیاز(مەبەست)

لەلایەکی ترەوە، دەتوانین هێزی پارچۆلکەکان بە ژمارەی چینەکانیان دیاری بکەین لەسەر پلیکانەی (رەگ).

<u>چەند راستی‌یەك لە رەفتاری یاسای هێزی رەگ دا</u> :

<u>یەکەم</u> : هیچ پارچۆلکە و گەردیلەیەکی ڕێزمانی ناتوانێت خانەکانی ئەم یاسایە جوودا بکاتەوە. ئەم راستی‌یە ئەوە دەگەیەنێت، کەوا لە رووی ڕێنووسەوە، دەبێت ئەم پارچۆلکانە بە لکاوی بنووسرێن لەسەرانسەری زمانەکە دا.

<u>دووەم</u> : خانەکانی (رەگ) بە هێزترین خانەی نەمر بوون لە پلیکانەی پێشکاردا و لە ناو خانەی (رەگ)، کەدەبێت بە پلیکانەی رەگ، خانەی (بنج) بە هێزترین خانەیە.کەواتە (بنج) بە هێزترین خانەی نەمرە لە کرداردا.

<u>سێیەم</u> : خانەکانی ئەم یاسایە بە ئەم چەشنە پۆلێن دەکرێت لە رووی دەمکاتەوە:

- خانە (بنج)، لە هەموو دەمکاتەکان هەیە.

- خانەی (ێن)، لە هەموو دەمکاتەکاندا بەکار دەهێنرێت،

بەپێی پێویستی گوفتار.

خانەی (ر)، تەنها هەر لە رابردوو و رانەبردوودا هەیە.

خانەی (نزیك) هەر لەرابردوودا هەیە و لە هەر چوار جۆرەکەی رابردوودا بە هەمان بارگە هەیە .

- خانەی (دوور) تەنها لە دەمکاتی رابردووی دوور ورابردووی تەواودا بارگەی هەیە .

- خانەی (مەبەست)، هەر لە رستەی نائاشکرای رابردوودا بارگەی هەیە.

چوارەم: لە رووی ئەرکەوە یاساکە بە ئەم چەشنە خانەبڕدەکرێت: وێنەی (٦)

پێنجەم: کورتترین روخساری ڕەگ بریتییە لە خانەی (بنج) لە رانەبردوو و فەرمان دا، وەك:

دە(گر) (م) یان ب(گر) (ە)

کورتترین رەگ لە رابردوودا بریتییە لە دوو خانەی (بنج) و(نزیك)، وەك:

(گر) (ت) (م) یان دە (م) (گر) (ت)

شەشەم : هەموو خانەکانی یاسای هێزی ڕەگ بە یەك جێباز دەژمێررێت بۆ بازی جیناو. ئەو جێناوەی کەوا پەیوەست دەبێت بە ڕەگەوە، دەلکێت بە خانەی کۆتایی‌یەوە.

حەوتەم : هەر خانەیەك بەکار نەهات ئەوا ڕەگەکە کرژ دەبێتەوە و دەچێتەوە یەك ۰ ئەگەر خانەیەکەش گەڕایەوە ئەوا یاساکە جێگای زگماکی خۆی بۆ چۆڵ دەکاتەوە واتا ڕەفتاری ئیلاستیك هەیە لە ڕوخساری ئەم یاسایەشدا.

هەشتەم : بە هیچ جۆرێك ڕەفتاری ئاوێتە بوون نی‌یە لە نێوان خانەکانی ئەم یاسایەدا، کەچی ئەو ڕەفتارە لە یاسای هێزی پێشکاردا هەبوو.

نۆیەم : درێژ ترین ڕوخساری ڕەگ بریتی‌یە لە کرداری تێنەپەری تێپەرێنراو بە (ێن)، لە دەمکاتی ڕابردووی دووردا و لە ڕستەی بکەر نادیاری نائاشکرادا، وەك :

وا گومانم کردبوو کەوا

(کەپرەکە) (ڕووخ) (ێن) (ر) (ا) (بوو) (بێت)

ئەمە بوو یاسای هێزی ڕەگ و کەڵکە گەورەکانی. بە هیوایین ئەو یاسایە ببێت بە کەرەستەی خشت بڕکردنی

زمانەکە و ببێت بە کەڵك و یاریدە بۆ دۆزینەوەی بەردە پیرۆزەکانی زمانێك، کەوا ڕێزمانەکەی بە جێگۆڕکێ و بە ئەرك گۆڕکێی جێناو ئاڵۆسکاوە.

## ٧- پلیکانەی روخساری کردار:

ئەگەر سەرنجی پلیکانەی (ڕەگ) وپلیکانەی (پێشکار)ی کردار بدەین،کەوا لەپێشتردا باس کران، دەبینین کەوا پلیکانەی پێشکار، لەخانەی (ڕەگ)دا چەند پارچۆلکەیەك لە بارگەی خانەکانی پلیکانەی کردار، هەڵ دەگرێت. ئەم تێك هەڵکێشە وای کرد لێمان کە ئەم دوو پلیکانەیە بکەین بە یەك، چونکە کردار بێ (پێشکار) و پارچۆلکەکانی (ڕەگ) ناتوانێت چالاکی بنوێنێت لە رستەدا. لەمەش شێوەی پلیکانە یەکگرتوەکەیە کە ناو نراوە (پلیکانەی کردار) : (وێنەی ٧).

لێرەدا پێویست ناکات کەوا بارگەی خانەکان روون بکەینەوە چونکەلەپێشتردا باس کران. ئەم پلیکانەیەش، وەك ئەوانی تر، لە جێی ئەوانی تر دەکەوێتە چالاکی بەلام چەند سەرنجێك هەیە بۆ روون کردنەوە، وەك :

- یەکەم : ئەم پلیکانەیەش لە شەش چین پێك هاتووە، بەرزترین چین بریتی یەلە (بنج) کەهیچ نموونەیەکی نی یە بەرستەی چالاك، لەزمانەکە دا. پێنج چینەکە ی تر دەست دەکەن بە چالاکی و هەموو کرداری زمانەکە دادەپۆشن .

- دووەم : هەر یەکێ لە ئەو بارگانە ئەگەر بەکار نەهات ئەوا ستوونەکەی لادەبرێت، بۆ نموونە ئەگەر (بکەر نادیاری) نەبوو لە رستەکەدا، ئەوا ستوونی (ر) نامێنێت، یان ئەگەر گیانی رابردووی لە رستەکەدا نەبوو ئەوا خانەکانی (نزیك) (دوور) (مەبەست) لادەچن .

- سێیەم : ستوونەکانی لای چەپ ولای راستی ستوونی (بنج) هەموو ئەو رەفتارانە دەپارێزن کەوا پێشتر هەیان بوو لە پلیکانەکانیان دا، (وێنەی ١و٢)

- چوارەم : بە پێی ئەم پلیکانەیە کردار بریتی‌یە لە (بنج) لەگەڵ چەند پێشکارێك وچەند پارچۆلکەیەك لە رەگ. ژمارەی ئەو پێشکار و پارچۆلکانە لە(یەك) کەمتر نابێت ولە(هەشت)زۆرتر نابێت، واتە هیچ نموونەیەك نی یە کەوا هەموو بارگەکان هەڵ بگرێت.

- پێنجەم : چینی ژێرەوەی پلیکانە دەتوانێت ببێت بە نوێنەری،

چونکە هەموو پارچۆلکەکان لە جێگای ئەندازەیی خۆیان دا هەڵ دەگرێت. ئەم چینە دەبێت بەیاسایەکی بێ هاوتا بۆ خشت بڕکردنی کرداری زمانەکە.

- شەشەم : چینی ژێرەوەی پلیکانەکە نموونەی نییە لە گوفتاردابەڵام بە دوو نموونە پڕ دەکرێتەوە :

(من)(نامەکە)م(بۆتۆ)(هەڵ)(نە)(دە)(گر)(—)(—)(—)(ت)(-)(—)

ڕەنگە (کەپرەکە)(—)(—)(-)(-)(-)(رووخ)(ێن)(ر)(ا)(بوو)(بێت)

- هەردوو نموونەکە ڕابردوون (بەردەوام و دوور) .

- هەردوو نموونەکە تێپەڕن ( تێپەڕ و تێپەڕێنراو) .

- یەکەمیان بکەر دیارە ودووەمیان بکەر نادیار .

- یەکەمیان ئاشکرایە و دووەمیان گوماندارە .

- حەوتەم : ئەم پلیکانەیە دەرگا دەکاتەوە بۆیەکلایی کردنەوەی زۆر بابەتی ڕێزمانی تر بۆ نموونە پۆلین کردنی ئەو ناوانەی کەوا لە کردارەوە وەرگیراون .

- هەشتەم : ئەو یازدە خانەیە کەوا لە ئەو یاسایەدا دیاری کراوە، لەم پەڕو ئەو پەڕی کردار دادەپۆشن بەڵام بەراست و چەپ دا ژمارە دەتوانێت بڕوات بۆ بەشەکانی تری ڕستە.

- نۆیەم : پاشگری (ەوە) باس نەکراوە لێرەدا چونکە جێگای زگماکی خۆی لە سنووری ئەو یازدە خانەیەدا نییە.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کەوا روخساری پلیکانەکە لە هەر سێ دەمکاتەکەدا نیگار بکێشینەوە: وێنەی (٨،٩،١٠)

ئەوەی شایانی باسە، ریزی ژێرەوەی ئەو سێ پلیکانەیە ناتوانێت بارگەکانی بە تەواوی پڕبکاتەوە لەیەك نموونەدا چونکە لە رانەبردوو و فەرمان دا خانە (نە) و (دە) ئاوێتە دەبن بۆ یەك خانە و لە دەم کاتی رابردوودا هەر بە دو رستە پڕ دەبێتەوە وەك لە پێشتردا باس کرا.

ئەمە بوو پلیکانەی کردار، کەوا تەنگ بەروخساری کردار هەڵدەچنێت و ئەم پەڕو پەڕی دیاری دەکات بەڵام لێرەدا ئەگەر سەیری پلیکانەی پێشکار و رەگ بکەین دەتوانین ئەم پلیکانەیش بە ئەو چەشنە ژمارە ریێز بکەین:

(٥)(٤)(هەڵ) (نە) (دە) (بنج) (یێن) (ر) (نزیك) (بوو) (با)

(٥)(٤) (٣) (٢) (١) (٠) (-١)(-٢) (-٣) (-٤) (-٥)

## ٨ ـ بنەڕەتی تێپەڕ و تێ نەپەڕ :

ئەگەر لە رووی هێزی تێپەڕینەوە سەیری کردارەکانی زمانەکە بکەین دەبینین دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم: بێ هێز(تێنەپەڕ)**

**جۆری دووەم: بە هێز(تێپەڕ)**

ئەگەر ئێمە چاوگ بکەین بە نوێنەری هەموو رێژە جیاوازەکانی کردار دەتوانین بڵێین چاوگی زمانەکەمان دوو جۆرن، چاوگی تێنەپەڕ و چاوگی تێپەڕ. بەڵام چاوگ چەندین جۆرە و بچووکترین روخساری چاوگ بریتییە لە (چاوگی بنجی). ئەم چاوگە بە چەند پێشکارێك درێژ دەبێتەوە و بە پاشگری ( ـەوە)یش درێژ دەبێتەوە بەڵام چی پاشگر و چی پێشگر، ناتوانن هێزی چاوگ بگۆڕن. بۆ نموونە ئەگەر چاوگی بنجی (کردن) تێپەڕ بێت چاوگی دارێژراوی (راکردن) هەر تێپەڕە بە کەرەستەی رێزمان، هەر چەندە (راکردن) بە واتا تێنەپەڕە. بۆ گۆڕینی هێزی چاوگی بنجی دوو کەرەستە هەن کە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن. ئەم دوو کەرەستەیەش نە پاشگرن نە پێشگر. یەکەمیان بریتییە لە پارچۆلکەی (ێن) کە تەنها دەچێتە سەر کرداری تێ نەپەڕ. دووەم کەرستە بریتییە لە پارچەکەی (ر)

کە تەنها دەچێتە سەر کرداری تێ پەڕ. ئەم دوو کەرەستەیە دوو جێگای نەگۆڕیان هەیە، کەوا دەکەونە نێوان رەگی چاوگی بنجی و پیتی رابردوو. ئەم خشتەیەیش ئەو هێڵە دەست نیشان دەکات کەوا تێپەڕ و تێنەپەڕ جودا دەکاتەوە، ، خشتەی (٧)

لە ئەو خشتەیەدا کە سەرانسەری کرداری زمانەکە دەگرێتەوە پێنج ویستگە دیاری کراوە. شانەکانی بیر تەنها ئەو پێنج دەمەیان هەیە بۆ دەربرینی زانیاری دەربارەی رووداوەکانی ناوبیر. ئەو وێستگانە دوانیان دەکەوێتە لای چەپی هێڵی دابڕین (تێپەڕەکان) و سیانیان دەکەویتە لای راستی هێڵی دابڕین (تێنەپەڕەکان). بەئەم پێیە دەتوانین ئەو جۆرە چاوگانە، کە دایکی هەموو رێژەکانی کردارن، وێنەیەکیش بکەین. لە وێنەی (١١)دا هەموو ئەو روخسارە سادانە دەردەکەون.

کەواتە چاوگی بنجی تێپەڕ یەك چاوگی بکەر نادیار (تێنەپەڕ) دروست دەکات و چاوگی تێ نەپەڕ دوو چاوگی تر دروست دەکات یەکەمیان بریتی‌یە لە چاوگی تێپەڕێنراو (تێ پەڕ) و دووەمیان بریتی‌یە لە چاوگی بکەر نادیار (تێ نەپەڕ).

سەبارەت بەوەرگرتنی جێناو هەموو ئەو چاوگانەی کە باس

کراون دەگەڕێنەوە سەر هەردوو خشتەی جێناوی تێپەڕ و تێنەپەڕ کە باس کراوە لە بەشەکانی پێشتردا . بە کورتی دەتوانین بڵێین :

نووسین و سووتاندن، پڕ بە پڕ ستوونەکانی خشتەی جێناوی تێپەڕ وەردەگرن و هیچ هێزیك ناتوانێت هێزی تێپەڕینیان بگۆڕێت، بەڵام چاوگی (سووتان و نووسران و سووتێنران) جێناوی تێنەپەڕ وەردەگرن وەك یەك . ئەم چاوگانە باکیان نی‌یە لە پاشگر و پێشگر لە رووی هێزەوە.

لە بەر ئەنجامی ئەم باسەدا دەتوانین بڵێین دوو کەرەستەی رێزمانی هەن کە هێزی تێپەڕین دەگۆڕن لە کرداردا :

یەکەمیان : (ێن)، لە تێنەپەڕەوە بەرەو تێپەڕ .

دووەمیان : (ر)، لە تێپەڕەوە بەرەو تێنەپەڕی بکەر نادیار.

یەکەمیان دەتوانێت یەك جۆر چاوگی تر پەیدا بکات و دووەمیان دەتوانێت دوو جۆری تر پەیدا دەکات. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بیری ئێمە پێنج رێگای هەیە بۆ سەوا کردن لەگەڵ هەر رووداوێك دا کە لێرەی دەکۆڵێتەوە. ئەمە بوو نەخشەی بن برکردنی تێپەڕو تێنەپەڕ لە کرداری زمانەکەدا. بە هیوام نەکەوینە بەر تیری رەخنەی کاڵو کرچ، چونکە هەندێك کرداری تر هەن کە رەنگە یەکێك لە

ئەو کەرەستانە وەرنەگرن وەك (مان) کە (ێن) وەرناگرێت و لە ئەنجامیشدا (ر) وەرناگرێت. یان ئەو چاوگانەی بکەر نادیارن ڕێژەی فەرمانیان نی‌یە چونکە فەرمان بەسەر کەسی نادیار دا ناکرێت. تێکڕا ئەوەی باس‌کرا لە پلیکانەی کرداردا بەشێوەیەکی زانستی و ئاشکرا لە خشتەکە دەدرێت. ئەمەش یەکێك بوو لە کەڵکەکانی پلیکانەکە وا لێرەدا دەی خەینەوە روو بۆ بەرەنجامی ئەم نووسینە.

لەسەر پلیکانەی ڕەگ ناوچەیەکی دوو ستوونی هەیە بۆ خانەی (ێن) و خانەی (ر) ئەم ناوچەیە بەرپرسیارە لە گونجاندنی هێزی تێپەڕینی کردار لە رستەدا. ئەم ناوچەیە بە (ناوچەی گونجاندن) ناوبراوە. ئەگەر ستوونی (ر) پڕ بوو ئەوا سەرانسەری رستەکە گونجێنراوە بۆ تێنەپەڕ و ئەگەر هەر خانەی (ێن) پڕ بوو ئەوا گونجێنراوە بۆ تێپەڕ و ئەگەر هەردوو خانەکە چۆڵ بوونە ئەوا هێزی تێپەڕین بە چاوگە بنجی‌یەکە دیاری دەکرێت. وێنەی( ٥ ) جێگای هەندەسی بە جوانی رەنگ ڕێژ دەکات بۆ ناوچەی گونجاندن .

## ٩ - جێ گۆڕکێی جێناوی ئەرکدار:

وەکو لە پێشتردا باس کرا پلیکانەی پێشکار باشترین پەیژەیە بۆ بازە هەندەسی‌یەکانی جێناوی ئەرکدار. ئەم بەشە تایبەتی‌یە تەنها بە جێ گۆڕکێی جێناوی لکاوی (بکەر) و(بەرکار). بۆ مەبەستی‌روون کردنەوە جارێکی تر پلیکانەکە دروست دەکەینەوە و لەسەری بازەکان دیاری دەکەین : (وێنەی ١٢).

لە ئەم پلیکانەیەدا جێبازەکانی جێناو بە ئەم چەشنەن:

- جێ بازی یەکەم : (رەگی کردار) لێرەدا هەموو پلیکانەی رەگ یەك جێبازە و جێناوەکە هەردەم پشتی دوا پارچەی رەگ دەگرێت .

- جێ بازی دووەم : خانەی بەردەوامی (دە).

- جێ بازی سێیەم : خانەی نەرێ (نە)، ئەگەر ئەرخانەیە لەگەل خانەی (دە) ئاوێتە بوو ئەو خانە تازەکە دەبێت بە جێباز. وەك،(مە)(یان)(گر)(ن).

- جێ بازی چوارەم : خانەی (پاشگر)

- جێ بازی پێنجەم : خانەی (ئامراز)، یان بۆ سەر بەرکاری ناراستەوخۆ .

- جێ بازی شەشەم : خانەی (بەرکار) کاتێك کەوا دەبێت بە نەلکاو لە بەر رووناکی ئەوەی باسکرا، جێناوی لکاوی ئەرکدار بە پێشایە تی بەئەم کەرەستانەوە دەلکێت:

١- پلیکانە رەگی کردار

٢- پێشکاری (بەردەوامی)

٣- پێشکاری (نەرێ)

٤- پێشکاری (پێشگر)

٥- پێشکاری (ئامرازی پەیوەندی)

٦- پێشکاری (بەرکار)

ئەمە بوو بازە ئەندازەیی‌یەکانی جێناو بەلاّم هەر کاتێك خانەیەك بۆش بوو ئەوا بازەکە دەروات بۆ پێشتر. ئەوەش بیر دەخەینەوە کەوا مەرجە جێ باز یەکەم پێشکار بێت لە سەرەتای کردارەکەوە .

ئێستاش چەند خالیکی گرنگ سەبارەت بە جێ گۆڕکێ دیاری دەکەین:

١- بۆ کرداری تێنەپەڕی بنجی و بکەر نادیار جێ گۆڕکێ نی‌یە.

٢- بۆ کاری تێپەڕو تێنەپەڕی تێنەپەڕێنراو (ئاندن) جێ گۆڕکێ هەیە و بەئەم چەشنە:

- لە ڕانەبردوو و فەرمان و ڕابردوودا جێناوی (بەرکار) جێ گۆڕکێ دەکات.
- جێناوی (بکەر) هەر لەڕابردوودا جێ گۆڕکێ دەکات.

٣- جێ گۆڕکێی جێناو یەك جۆر نییە بەڵام ئەم نووسینە تەنها جێناوی خشتەی (١) و (٢) دادەپۆشێت .

## ١. ـ ئەرك گۆڕکێی جێناوی ئەرکدار:

مامۆستای بەڕێز جەمال نەبەز (ئاسۆی زانکۆیی، ژمارە ٩ ی ساڵی ١٩٧٨)دا دەڵێت کەوا ئەم دیاردەیە نوێباوە و ڕەسەنییە لە زمانەکەدا. ئێمەش لەگەڵ بیرو ڕای مامۆستا نەبەزداین، بەڵام هەموو دیاردەیەکی نوێ دەبێت پێویستییەکانی پەیدا بوونی بۆ دروست بووبێت ئەمجا پەیدا بووبێت. لە سەر ئەرك گۆڕکێ چەند لێکۆڵینەوەیەك ئامادە کراوە و هەموو لایەنەکانی بەر زەبری نووسین کەوتووە، بەڵام لە ئەم نووسینەی بەردەست دا تەنها کاکڵەی ئەرك گۆڕکێی جێناوی لکاوی ئەرکدار باس کراوە ئەویش لە ڕووی میکانیزمی پیادە کردنی لە گوفتاردا.

جێ گۆڕکێ جێناو، وەکوو لەپێناسەکان دا وترا، بریتییە لە

بازدانی ئەندازەیی جێناوی لکاو بەسەر پێشکارەکانی کرداردا یان لە کۆتایی رستەوە بەرەوە سەرەتای رستە بەڵام ئەرك گۆڕکێ بریتی‌یە لە پاشەکشێی جێناوی لکاو لە سەرەتای رەستەوە بەرەو کۆتایی رستە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەوا ئەم دوو دیاردەیە دوو ئاراستە (یان دوو رووکار)ی دژ یەکیان هەیە. ئەمەش باشترین ئەندازەیە بۆ جوودا کردنەوەی ئەم دوو میکانیزمە تێك هەڵکێشە. ئێستاش لە سەر یاسای هێزی پێشکار ئەم دوو رووکارە دیاری دەکەین:

(رووکاری جێ گۆڕکێ)

(بەرکار)(ئامراز)(هەڵ)(نە)(دە)(رەگ)

(رووکاری ئەرك گۆڕکێ)

هەڵ و مەرجەکانی ئەرك گۆڕکێ : (لە بواری ئەم نووسینەدا) :

- یەکەم : تەنها هەر لە کرداری تێپەڕدا روو دەدات.

- دووەم : تەنها هەر لە دەمکاتی رابردوودا روو دەدات. رابردووش بەهەر چوار جۆرەکەیەوە.

- سێیەم : بە پێی خاڵی یەکەم و دووەم تەنها هەرستوونی (بەرکاری رابردوو) لە خشتەی (٢)دا ئەم دیاردەیە پیادە دەکات.

- چوارەم : دەبێت بەرکاری ڕستە بە جێناوی لکاوی ئەرکدار جێگیر کرابێت .

- پێنجەم : دەبێت بەرکارە لکاوەکەش (نادیار) نەبێت، وەك بۆ کەسی سێیەمی تاك لە ستوونی ئەرك گۆڕکێ دا.

ئەرك گۆڕکێ خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کەوا جێناوێك ئەرك دەگۆڕێت، وەك لە بکەرەوە بۆ بەرکار. لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا جێناوە تازەکە پاشەکشێ دەکات بۆ پاش (رەگ) بەپێی رەفتاری زگماکی خۆی. لە میکانیزمی ئەم جێ گۆڕکێیەدا، پەڕبەپڕ بارگەی خانەکانی ستوونی بەرکاری رابردووی تێپەڕ (خشتەی ٢) دەگۆڕێت بۆ بارگەی ستوونی بکەری رابردووی تێنەپەڕ (خشتەی ١)، وەك لەسەر خشتەی (٨)دا دیاری کراوە .

لەئەم خشتەیەدا:

١- کەسی سێیەمی تاك لە هەردوو بارەکەدا نادیارە.

٢- کەسی یەکەمی تاك (م) هەمان ڕوخساری هەیە.

٣- هەموو ئەوانی تر ڕوخساریان دەگۆڕێت .

٤- پاش ئەرك گۆڕکێ (تان) و (یان) دەبن بە هاوڕوخسار (ن).

ئێستاش ئەم میکانیزمە لەسەر پلیکانەی پێشکار پیادە دەکەین،

لەسەر کردارێکی تێپەڕ لە دەمکاتی رابردوودا و بە شێوە ئاخاوتنی گەرمیان، ئەویش بە پێی ئەو هەلو مەرجانەی دیاری کران لە پێشتردا. لە پاش ئەمە ئەرك گۆڕکێی کوێستان بەسەر هەمان پلیکانەدا پیادە دەکرێت: (وێنەی ١٣ و ١٤).

لە سەر ئەم دوو پلیکانەیە بە تەواوی گەرمیان و کوێستان جو داکرانەوە و ئەم خالآنە جێگیر کران:

١- لە شێوەی گەرمیاندا جێناوی بکەرو بەرکار جێ گۆڕن کەچی لە شێوەی کوێستان دا تەنها هەر بکەر جێ گۆڕە.

٢- شێوەی کوێستان هەمان شێوەی گەرمیانە بەلآم لە ئێرەدا ئەرك گۆڕکێی جێناو سەربارە.

٣- خانەی کۆتایی هەر دوو پلیکانەکە وەك یەك وان .

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| [گرت](م) | | | | | |
| [گرت] | [ده](م) | | | | |
| [گرت] | [ده] | [نه] (م) | | | |
| [گرت] | [ده] | [نه] | [هه‌ل'](م) | | |
| [گرت] | [ده] | [نه] | [هه‌ل'] | [ئۆتۆ] (م) | |
| [گرت] | [ده] | [نه] | [هه‌ل'] | [ئۆتۆ] | [نامه‌كه](م) |

وێنه‌ی (١) پلیكانه‌ی پێشگرلو

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| چراكه | ده | [سووت] | (بت) | | | | | |
| چراكه | ده | [سووت] | [ین] | (بت) | | | | |
| چراكه | ده | [سووت] | [ین] | [ر] | (بت) | | | |
| چراكه | — | [سووت] | [ین] | [ر] | [ا] | (−) | | |
| چراكه | — | [سووت] | [ین] | [ر] | [ا] | [بوو] | (−) | |
| چراكه | — | [سووت] | [ین] | [ر] | [ا] | [بوو] | [با] | (−) |

وێنه‌ی (٣) . پلیكانه‌ی ره‌گ




وینەی (٣)، دابەش کردن بەپێی دەمکات




وینەی (٤) ناوچەی رانەبردوو و فەرمان




**وینەی (٥) ناوچەی گونجاندن لە پلیکانەی رەنگ دا**




**وینەی (٦) . ئەرکی رەنگ**




وێنەی (١١): وەرچەرخاندنی هێزی چاوگ




وێنەی (١٢) جێ گۆڕکێی جێناوی ئەرکدار




وینەی (١٣) پلیکانەکە بەشێوەی گەرمیان (بێ ئەرک گۆڕکێ)




وینەی (١٤) پلیکانەکە بەشێوەی کوێستان (لەگەل ئەرک گۆڕکێ)




**خشتەی (٧)، هێزی کردار**

| جیناوی لکاو | رابردووی تی'پەر | | رابردووی تی'نەپەر | |
|---|---|---|---|---|
| | بکەر | بەرکار | بکەر | بەرکار |
| | م | م | ← م | — |
| | ت | ت | ← یت | — |
| | ی | — | ← — | — |
| | مان | مان | ← ین | — |
| | تان | تان | ← ن | — |
| | یان | یان | ← ن | — |

**خشتەی (٨) . ئەرك گۆڕکێی جیناوی ئەرکەدار**

# بەشی پێنجەم

# بیردۆزی بگۆڕ ونەگۆڕ لە پلیکانەی کرداردا

## ـ بگۆڕ و نەگۆڕ :

ئەم بیردۆزەیە لەسەر ئەو راستی یە رۆنراوە کەوا هەر رستەیەك لە زمانەکە دا خانەریژ دەکریت وهەموو خانەیەك بارگەی دیاری کراوی خۆی هەیە. وەکوو دیاردەیەکی فیزیاوی، هەموو خانەیەك (ریز) و (هێز)ی خۆی دپارێزیت لەزنجیرەی گوفتاردا. لەزمانەکەماندا، بەتایبەتی لە مۆرفۆلۆژی وسێنتاکس دا، رێزمانی کردار ئالۆزترین بەشە، بەرادەیەك هەموو ریزمانەکە دەگرێتەوە.

لە بەشەکانی رابردوودا رێزمانی رستە و کردار باس کران وچەندین یاسا و پلیکانە دیاری کران، پاشان توانرا روخساری فیزیاوی کردار دیاری بکرێت بەجوانی، بەلام نهێنییەك مایەوە کە لە ئەوێدا باس نەکرا لە بەر ئەم خالانە :

یەکەم : پردێك لە بیری خوێنەردا دروست بکەین لە نێوان رێزمانی نووسراو و بابەتی بەردەست دا.

دووەم : رێزمانە نووسراوەکە متوربە بکەین بە بیروبۆچوونی خۆمان،

بەتایبەتی بابەتە ئەم و مژدارەکان.

سێیەم : هەڵ وەشاندنەوەی هەندێك بیروبۆچوونی نەگونجاو لەگەڵ ئەم بابەتە دا.

چوارەم : داڕشتنی هەندێك کەرەستەی ڕێزمانی کە تا ئێستا گرێدراو بوون.

پێنجەم : ڕاهێنانی خوێنەر لەگەڵ ئەو میکانیزم و دیاردە فیزیاوی وماتماتیکییانەی کەوا بەکار دەهێنرێن بە شێوەیەکی ئاسان و پیادەکراو.

ئەو نهێنی یەش ئەوەیە کەوا هەموو کردارێك وهەموو ڕستەیەك پێك هاتوون لە (بگۆڕ و نەگۆڕ) وئەم بگۆڕ ونەگۆڕانەش ڕەفتاری ماتماتیکی خۆیان هەیە. گیانی (بگۆڕایەتی) لەڕستەدا شتێکی رادەیی یە، بۆنموونە لەکرداردا (بنج) نەگۆڕە وهەموو خانەکانی تر بگۆڕن. لە ڕستەی ڕانەبردوودا (بنج) و خانەی بەردەوامی (دە) و (بکەر)ی ڕستە نەگۆڕن. سەرەڕای ئەو بگۆڕ و نەگۆڕە (جێگۆڕ) و (جێنەگۆڕ)یش هەیە. بۆ نموونە گیانی (جێگۆڕین) لەجێناوی لکاودا شتێکی ئاشکرایە. ئەم بابەتەی داهاتوویش بریتی یە لەپێناسەی ئەم چوار زاراوە زانستی یە :

١ـ نەگۆڕ : ئەو کەرەستە ڕێزمانی‌یە یە کە لە بابەتێکی دیاری کراودا هەر هەیە وهەرگیز خانەکەی ناکرێت بە (بۆش). بۆنموونە (بنج) لەکرداردا هەوو وەختێك پڕە. هیچ ڕێژەیەك یان وشەیەکی وەرگیراو نی‌یە کەوا، وەك کەمترین شت، ئەو (بنج)ە هەڵ نەگرێت. هەر لەبەر ئەوە دەتوانین (بنج) ناوبنێین (نەگۆڕی هەمیشەیی). لەلایەکی ترەوە هەندێك نەگۆڕ هەیە لەبارێك دا نەگۆڕن و لەبارێکی تردا بگۆڕن. ئەوانە دەووترێت پێیان (نەگۆڕی رادەیی). بۆ نموونە خانەی رابردووی (نزیك) هەر بەرادەی رابردوو (نەگۆڕ)ە بەلاّم لەرانەبردوو و فەرمان دا، خانەکەی بۆشە.

٢ـ بگۆڕ : ئەو کەرەستەیە کەوا بەرادەی بابەتێکی ڕێزمان بتوانێت هەبێت یان نەبێت. بۆ نموونە خانەی (ێن) تەنها لە کرداری تێنەپەڕی تێپەڕێنراودا هەیە بەلاّم لە زۆر جێی تردا هەر پێویست نی‌یە. بەزمانێکی تر دەتوانین بلێین هەموو (بگۆڕ)ێك دەتوانێت ببێت بە (نەگۆڕ) بەرادەی بابەتێك و دەتوانێت ببێت بە (نەبوو) بەرادەی بابەتێکی تر ..

٣ـ جێ‌نەگۆڕ : ئەو کەرەستانەیە کەوا جێگای خۆیان دەپارێزن وبازبازێن ناکەن بە پلیکانەی کرداردا. بۆ نموونە خانەی (دە)

بریتی‌یه له یه‌که‌م دراوسێی خانه‌ی (بنج) لای راسته‌وه. ئه‌گه‌ر (ده) هه‌بوو ئه‌وا له ئه‌وێ‌یه و ئه‌گه‌ر نه‌بوو ئه‌وا جێگاکه‌ی هه‌ر ده‌مێنێت له بیردا به‌ڵام ئه‌گه‌ر هاته‌وه جێیه‌که‌ی خۆی به‌که‌س نادات.

٤ـ جێگۆڕ : ئه‌و که‌ره‌ستانه‌یه که‌وا ده‌توانن بازبازێن بکه‌ن به پلیکانه‌ی کرداردا. بۆ نموونه جێناوی لکاوی (به‌رکار) جێگۆڕه و له‌گه‌ڵ بارودۆخی رسته‌دا جێ ده‌گۆڕێت. بزانُی جێگۆڕین به دیارده‌ی (جێگۆڕکێ) ناو براوه له ئه‌م نووسینه‌دا. له بڕگه‌کانی پێشتردا که‌ره‌سته‌ی جێگۆڕ و جێنه‌گۆڕ به‌جوانی روون کراونه‌ته‌وه.

## ٢ـ بگۆڕ و نه‌گۆڕ له‌کرداردا :

په‌ڵوپۆی کردار زۆر فراوانه وپێویست ده‌کات که جڵه‌وی هه‌موو ئه‌و رێژانه‌ی که‌وا له رێزمانی کرداردان، بخه‌ینه سه‌ر زاراوه‌ی چاوگ. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی چاوگ بریتی‌یه له کۆکه‌ره‌وه‌ی ئه‌لبوومی کردار له‌فه‌رهه‌نگ دا.

له‌کرداری زمانه‌که‌دا دوو جۆر که‌ره‌سته هه‌یه که‌وا بتوانن روخساری کردار بگۆڕن :

یه‌که‌م ـ بگۆڕی ناوه‌کی : ئه‌م بگۆڕانه‌ی ده‌چنه ناو ره‌گی کرداره‌وه

و هیچ کەرەستەیەکی ڕێزمانی بۆی نیە کەوا بترنجێتە نێوانیانەوە یان بتوانێت کردار کەرت بکات. ئەم بگۆڕانە بریتین لە :

١ـ پارچۆلکەی تێپەڕاندن (ێن).

٢ـ پارچۆلکەی بکەر نادیار (ر).

٣ـ پارچۆلکەی رابردوو پیتی رابردوو (ا، د، ت، ی، و).

٤ـ پارچۆلکەی رابردووی دوور و تەواو (بوو/ وو).

٥ـ پارچۆلکەی نیاز و گومان (با/ب/بێت) لە رابردوودا.

پارچۆلکەی (١ و ٢) دەچنە ڕێزمانی چاوگەوە و پارچۆلکەی (٤،٥) پەیوەندییان نیە پێیەوە.

دووەم ـ بگۆڕی دەرەکی : ئەم بگۆڕانە دەچنە تویکڵی کردارەوە، واتە ناچنە نێو ڕەگی کردارەوە. ئەم جۆرە بگۆڕە، کەرەستەی ڕێزمانی تر دەتوانێت بە ئاسانی جوودایان بکاتەوە لە ڕەگی کردار، بە تایبەتی جێناوی لکاوی بکەر و بەرکار. ئەم بگۆڕانەش ئەمانەن :

١ـ پێشکاری بەردەوامی : (دە، ب)

٢ـ پێشکاری نەرێ : (نە، نا، مە)

٣ـ پێشکاری پێشگر : (هەڵ، دا، ڕا،... هتد)

٤ـ پێشکاری ئامرازی پەیوەندی.

٥- پێشکاری بەرکار : هەموو بەرکارێکی ئەلکاوی کرداری تێپەڕ.

پێشکاری (١) لە چاوگدا دەرناکەوێت بەڵام پێشکاری(٢، ٣، ٤، ٥) بە پێی پێویستی لەچاوگدا دەردەکەون.

بەکورتی هەموو ئەو بگۆڕانەی ناوەکین دەلکێن بە پشتی بنجەوە و هەموو ئەوانەی دەرەکین دەلکێن بە پێشی بنجەوە. تەنها یەك بگۆڕی دەرەکی هەیە بەناوی پاشگری (دووپات یان دوولۆ)، کەدەکەوێتە پاش رەگ و پاش بکەرو بەرکاری لکاو.

پاش ئەوەی دوو جۆر لە (بگۆڕ) دەست نیشان کران، ئەویش بگۆڕ ناوەکی و بگۆڕی دەرەکی، دەبێت ئەو راستییە نیشان بکەین کەوا زاراوەی (بگۆڕ) ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەرەستانە (نەگۆڕ) نین. واتە بە پێی پێویست لە هەندێ کردار و چاوگ دا بەکار دەهێنرێن و لە زۆر جێی تردا بەکار ناهێنرێن. لە روانگەی ئەم بۆ چوونەوە، دەتوانین بەرانبەر بە (بگۆڕ) زاراوەی (نەگۆڕ)یش بخەینە بەر رووناکی لێکۆڵینەوە. لە یەکەم هەنگاودا (نەگۆڕ) ئەو کەرەستانەیە کەوا هەر هەن و هەر زیندوون و هەر چالاکن لە کردار و چاوگ دا. لە کردار و لە هەموو ئەو ووشانەدا کەوا لە کردارەوە

وەرگیراون، (بنج) نەگۆڕە. بۆ نموونە لە هەموو چاوگێکدا (بنج) و (پیتی رابردوو أ، د، ت، ی، و) و (ن)ی چاوگ نەگۆڕن، بە ئەم شێوەیە :

**چاوگی بنجی= بنج + پیتی رابردوو + نوونی چاوگ**

ئەم چاوگە شایستەی ئەوەیە کەوا ناو بنرێت (بنجی) چونکە هەموو کۆلکەکانی (نەگۆڕ)ن. لە چاوگەکەکانی تردا ئەم یاسایە پیادە دەکرێت:

**چاوگ بە گشتی= رەگ + پیتی رابردوو + نوونی چاوگ**

ئەم هاوکێشەیە گشتییە چونکە رەگی کردارەکە دەتوانێت هەر (بنج) بێت یان (بنج) و بگۆڕی ناوەکی بێت یان (بنج) و بگۆڕی دەرەکی بێت، یان (بنج) و بگۆڕی ناوەکی و دەرەکی بێت. ئەوەی ژێرەدا باس دەکرێت، دەبێت بە هۆی پەیدا بوونی پێنج جۆر لە چاوگ و هەر جۆرێکیش دەتوانێت (ژێر جۆر) دروست بکات.

## ٣ـ ئەرکی بگۆڕ لە کرداردا:

### یەکەم ـ بگۆڕی ناوەکی :

ئەم بگۆڕانە بەچەند ئەرکێك هەڵدەستن لە کرداردا، وەك :

### ١ـ دەمكاتی كردار :

ئەگەر بگۆڕی ناوەكی (نزیك)، واتە خانەی پیتەكانی رابردوو، (پڕ) بوو ئەوا رستەكە رابردووە بێ مشت و مڕ و ئەگەر (بۆش) بوو ئەوا رستەكە یان رانەبردووە یان فەرمان. بۆ زانین، ئەگەر خانەی (نزیك) بۆش بوو ئەوا دوو خانەكەی پاشی هەر بۆش دەبن.

خانەی (نزیك) و (دوور) بەرپرسیارن لە چوار جۆر رابردوو (نزیك، بەردەوام، دوور، تەواو).

### ٢ـ هێزی تێپەڕین :

ئەگەر خانەی (ێن) پڕ بوو ئەوا رستەكە تێپەڕە و ئەگەر خانەی (ر) پڕ بوو ئەوا رستەكە تێنەپەڕە و بكەر نادیارە. ئەم دوو بگۆڕە ناوەكی‌یە بەرپرسیارن لە هێزی تێپەڕین ئەگەر هەبن . ئەگەر نەبن ئەوا (بنج) ئەو ئەركە دەبینێت.

### ٣ـ نیازداری و گومانداری :

بگۆڕی ناوەكی (مەبەست) بەرپرسیارە لە نیاز و گومان لەرستەی رابردوودا و بەس. نە بوونی ئەو خانەیە نەبوونی نیاز و گومان

دەگەیەنێت لە رستەی رابردوودا.

دووەم ـ بگۆڕی دەرەکی :

١ـ بەردەوامی :

لە پێشتردا ووترا ئەگەر خانەی (نزیك) بۆش بوو ئەوا رستەکە رانەبردووە یان فەرمانە. ئەم دوو دەمکاتە بەردەوامی هەیە لەناویاندا, هەر لە بەر ئەوە خانەی بەردەوامی دەردەکەوێت. ئەم خانەیە لە رابردوودا نىیە مەگەر رابردوویەك بەردەوامی هەبێت تێیدا وەك (رابردووی بەردەوام). ئەمە ئەوە دەبەخشێت کەوا خانەی (دە) بەرپرسیارە لە بەردەوامی (رانەبردوو و رابردوو و فەرمان) نەوەك لە دەمکات. ئەم بگۆڕە بە تینی (نیاز و گومان و فەرمان) روخسارەکەی دەگۆڕێت بۆ (ب).

٢ـ ئەرێ و نەرێ :

خانەی نەرێ (نە) ئەگەر بارگە دار بوو ئەوا رستەکە (نەرێ)یە و ئەگەر بێ بارگە بوو ئەوا

(ئەرێ)یە ئەم بگۆڕە دەرەکی‌یە ئەرکەکەی زۆر روون و ئاشکرایە.

۳- <u>واتا گۆڕین</u> :

ئەگەر بگۆڕی (پێشگر) هاتە کایەوە ئەوا واتای (بنج) دەگۆڕێت. ئەم بگۆڕە بێلایەنە لە دەمکات و لە هێزی تێپەڕین لە رووی رێزمانەوە.

٤- <u>راستەوخۆیی وناراستەوخۆیی</u> :

هەر کرداریک خانەی (ئامرازی پەیوەندی) هەڵگرت ئەوا گیانی ناراستەوخۆیی تێداهەیە و ئەگەر ئەو خانەیە چۆڵ بوو ئەوا رستەکە راستەوخۆیە.

٥- <u>تەواو کردنی کرداری تێپەڕ</u> :

کرداری تێپەڕ پێویستی هەیە بە بەرکار وبگۆڕی (بەرکار) ئەو ئیشە جێبەجێ دەکات.

٦- <u>بگۆڕی دەرەکی،پاشگری (ەوە)</u> :

تەنها ئەم پاشگرە دەرەکی‌یە دەکەوێتە پاش کردارەوە بەڵام دوو ئەرکی گرنگ دەبینێت - یەکەمیان، گیانی دووبارەیی لە ڕووداوی کردارێك بەگشتی. دووەمیان،

گۆڕینی واتای کردار وەك ئەرکی بگۆڕی (پێشگر).

ئەم بگۆڕە گشتی‌یە بۆ کرداری زمانەکە و دەتوانێت

هەبێت یان نەبێت.

بەئەم چەشنە توانیمان ئەرکی بگۆڕی ناوەکی و ئەرکی بگۆڕی

دەرەکی جو :دا بکەینەوە.

## ٤ـ بارگەی خانەکانی پلیکانەی کردار :

وەکوو لە «وێنەی ١٥»دا دیارە، بارگەی هەموو خانەکان بارگەی خانەکانی پلیکانەکە دیاری کراون بەڵام سەرجەمی ئەو بارگانە بە ئەم چەشنە پۆلین دەکرێن :

پۆلی یەکەم : بارگەی خانە ڕێزمانی‌یەکان، (ڕەگەزە وردەکان) :

بارگەی ئەو خانە ڕێزمانی‌یانە بریتین لە پارچۆلکە وگەردیلە ی بێ واتا وبێ بڕشت. ئەو بارگانە بە ژمارە ژمارەیان دیاری کراوە بەروخساریش لە فەرهەنگی زمان دا نین. ئەو خانانەش کە ئەم جۆرە بارگەیە هەڵ دەگرن ئەمانەن :

ـ خانەی (مەبەست) : لە هەموو زمانەکە دا تەنها هەر بە

سێ روخسار پڕ دەبێتەوە، ئەویش (با، ب، بێت).

- خانەی (دوور) : لە هەموو زمانەکەدا ئەم خانەیە هەر دوو بارگەی هەیە، ئەویش (بوو، و ).

- خانەی (نزیك) : لە هەموو زمانەکەدا بە یەکێك لەئەم پێنج پیتە پڕ دەکرێتەوە، (ا، د، ت، ی، و).

- خانەی بکەر نادیار، (ر) : ئەم خانەیە هەر بەیەك بارگە پڕ دەبێتەوە، ئەویش (ر) بۆ رانەبردوو و بۆ رابردوو.

- خانەی تێپەڕاندن (ێن) : ئەم خانەیە بە دوو روخسار پڕدەبێتەوە، (ێن) بۆ هەموو زمانەکە، (ان) بۆ پیتی رابردوو (د) لەخانەی (نزیك) دا.

- خانەی بەردەوامی (دە) : ئەم خانەیە تەنها دوو روخساری هەیە (دە) و (ب).

- خانەی نەرێ (نە) : بارگەی ئەم خانەیە بریتی‌یە لە (نە)، بەڵام لە ئاوێتە بووندا لەگەڵ خانەی بەردەوامی دەتوانێت روخساری (نا) و روخساری (مە) وەربگرێت،کەچی لەکرداری بوون وهەبووندا دەبێت بە (نی).

پۆلی دووەم: بارگە خانە فەرهەنگی‌یەکان :

بارگەی ئەم خانانە لە فەرهەنگدا هەن و وشەی سەربەخۆن و بەپێی پێویست بەکار دەهێنرێن :

- خانەی (بنج) : بارگەی ئەم خانەیە بریتی‌یە لە بنجی ئەو چاوگە بنجی‌یانەی کەوا لە لەفەرهەنگدا هەن و بەپێی رووداوی نێو رستەکە دەخوازرێن.

- خانەی (بەرکار)، بارگە،ئەم خانەیەش بریتی‌یە لە «ناو» و لە «برگەی ناو ». هەموو ئەو کەرەستانەی لە فەرهەنگدا هەن.

پۆلی سێیەم : بارگەی خشتە رێزمانی‌یەکان :

بارگەی ئەم خانانە سەربارن لە کەرەستە فەرهەنگی‌یەکانی پۆلی دووەم ، ئەم پۆلەش دوو خانە دەگرێتەوە :

- خانەی (پێشگر) : ئەم پێشگرانە هەندێك کەرەستەن کەوا دەلکێن بە چاوگەوە واتاکەی دەگۆڕن و چاوگێکی داڕێژراو ریز دەکەن لە فەرهەنگ دا چونکە (گرتن) هەیە و(هەڵ گرتن)یش هەیە. پێشگری (هەڵ) کەرەستەیەکی رێزمانی‌یە مەگەر هەر لە فەرهەنگی زمانەوانی‌دا هەبێت.

ـ خانەی (ئامرازی پەیوەندی) : ئەم ئامرازانەش دەتوانن بە روخساری لکاو و نەلکاو هەبن و دەتوانن بارگەی فەرهەنگی هەڵ بگرن.

ئەمە بوو نەخشە رێزمانییەکە کەوا لە بیری هەموومان دا بووە بە مەکینەی «زمانی شیری» یان «زمانی دایك». ئەو مەکینەیەی دانامێنێت لە دروست کردنی ژمارەیەکی بێ کۆتایی لە رستەی رێزماندار.

## ٥ـ بگۆڕ و نەگۆڕ لە چاوگ دا

لە بەشی بگۆڕ و نەگۆڕدا چاوگ، وەك کۆکەرەوەی هەموو رێژەکانی کردار ناسرا. لە وێنەی (١٦)دا جارێکی تر لە چاوگ نزیك دەبینەوە بەو هیوایەی بتوانین ئەم پەڕ و ئەو پەڕی دیاری بکەین. لە سەرەتاوە چەند راستییەك دووبارە دەکەینەوە کەوا لە رێزمانی نووسراودا دیاری کراون، وەك :

یەکەم : لە فەرهەنگی چاوگ دا هەموو وشەیەك دوو (نەگۆڕ) هەڵ دەگرن و لە روخساردا دەردەکەون. یەکەمیان (پێشگری [illegible]

دووەمیان بارگەی خانەی رابردووی (نزیك) کەوا بریتییە لە یەکێك

له ئەم پێنج پیتە (أ، د، ت، ی، و).

دووەم : سێ خانەی پلیکانەی کردار بە هیچ جۆرێك لە روخساری چاوگدا نین و دەرناکەون، خانەی بەردەوامی (دە)، خانەی رابردووی دوور (بوو) و خانەی (مەبەست) لە نیاز و گومان دا.

سێیەم: هەموو جۆرەکانی چاوگ پیتی (ن) هەڵ دەگرن وەك پیتی کۆتایی وناونراوە(نوونی چاوگ).

چوارەم: خانەی نەرێ (نە)، خانەیەکی گشتی‌یە و دەچێتە سەر هەر ڕێژە و وشەیەك کەلە کردارەوە هاتبێت بێ بەرهەڵستی. لە روانگەی ئەم بابەتەوە بگۆڕێ (نە) ژمارەی بارگە فەرهەنگی کردار و چاوگ دووبارە دەکاتەوە.

پێنجەم : خانەی (ئامرازی پەیوەندی) زۆر ئاڵۆزە و دەتوانێت بارگەی دوور و درێژ هەڵ بگرێت و دەتوانێت بکشێت بۆ باشی (ڕەگ). ئەم خانەیە بە شێوەیەکی گشتی دەردەکەوێت لە چاوگ دا.

شەشەم : لە روخساری چاوگدا، بە هیچ جۆرێك، نە (جێناوی لکاو) هەیە و نە دەمکات هەیە.

حەوتەم : ووشەی چاوگ «ناوێکی سەربەخۆیە دەچێتە نێو ڕێزمانەوە بەبێ داڕشتن و لەتکردن، وەك (نووسینەکە، دوو دانیشتن،

دانیشتەکان، لە نووسین دا).

لەبەر رووناکی ئەو خاڵانەی سەرەوە دەتوانین پلیکانەی کردار کورت بکەینەوە، بەئەو چەشنەی لە سەر وێنەکە دەرخراوە. ئەو یاسایەی بۆ چاوگ دانراوە بریتی‌یە لە ئەم بگۆڕ و نەگۆڕانە :

نەگۆڕەکان : (بنج) و نیشانەی رابردوو (نزیك) و(نوون)ی چاوگ.

بگۆڕەکان : دوو بگۆڕی ناوەکی (یێن) و(ڕ) و دوو بگۆڕی دەرەکی (بەرکار) و (پێشگر).

ئێستاش بە سووك و ئاسان دەتوانین بلێین ئەو سێ نەگۆڕە چاوگی بنجی دروست دەکەن و ئەو چوار بگۆڕەش چاوگی بنجی وەردەچەرخێنن بۆ سەر چەند روخسارێکی تر کەوا بنجی نین، بە ئەم چەشنە :

یەکەم : <u>بنج و بگۆڕی ناوەکی</u> : واتە خانەکانی (بنج)،(یێن)،(ر)، ئەم سێ خانەیە دەتوانن بەئەم چەشنە چاوگ پەیدا بکەن :

(-)+(-)+(بنج)+(یێن)+(ر)+(نزیك)+ن

لەئەم بەشەدا ئەم چاوگانە دروست دەبن :

١- (بنج) (ـ) (ـ) (نزیك) (ن)

٢- (بنج) (یێن) (ـ) (نزیك) (ن)

٣ـ (بنج) (ـ) ( ر) (نزيك) (ن)

٤ـ (بنج) (ێن) ( ر) (نزيك) (ن)

دووەم : بنج و بگۆڕی دەرەکی : واتە خانەکانی (بەرکار)، (هەڵ)، (بنج)، ئەم سێ خانەیە دەتوانن بەئەم چەشنە چاوگ پەیدا بکەن :

(بەرکار) (پێشگر) (بنج) (–) (—) (نزیك) (ن)

لە ئەم بەشەدا ئەم چاوگانە پەیدا دەبن :

٥ـ (بەرکار) (–) (بنج) (نزیك) (ن)

٦ـ ( —— ) (پێشگر) (بنج) (نزیك) (ن)

٧ـ (بەرکار) (پێشگر) (بنج) (نزیك) (ن)

سێیەم : بنج و بگۆڕی ناوەکی و بگۆڕی دەرەکی:ئەم جۆرە چاوگانە بگۆڕی دەرەکی لەیەك روخساردا هەڵ دەگرن :

(بەرکار) (پێشگر) (بنج) (ر) (نزیك) (ن)

لە ئەم بەشەدا ئەم چاوگانە پەیدا دەبن :

٨ـ(بەرکار) (ـــ) (بنج) (ێن) (نزیك) (ن)

٩ـ(ـــــ) (پێشگر) (بنج) (ێن) (نزیك) (ن)

١٠ـ(بەرکار) (پێشگر) (بنج) ( ر) (نزیك) (ن)

١١ـ(بەرکار) (ـــ) (بنج) ( ر) (نزیك) (ن)

١٢ـ(ـــــ) (پێشگر) (بنج) ( ر) (نزیك) (ن)

١٣ـ(بەرکار) (پێشگر) (بنج) ( ر) (نزیك) (ن)

١٤ـ(بەرکار) (ـــ) (بنج) (ێن) (ر) (نزیك) (ن)

١٥ـ(ـــــ) (پێشگر) (بنج) (ێن) (ر) (نزیك) (ن)

١٦ـ(بەرکار) (پێشگر) (بنج) (ێن) (ر) (نزیك) (ن)

ئەم بیرکاری‌یە وردە، وای کرد کەوا (١٦) یاسا دروست ببێت بۆ دارشتنی روخسارەکانی چاوگ ئێستاش هەموو ئەو یاسایانە نموونە ریز دەکەین لە خشتەی (٩) دا.

لەبەر رووناکی ئەو خشتەیە چەند راستی‌یەك دەردەکەوێت بە ئەم چەشنەی خوارەوە:

١ـ تەنها (١٢) یاساتوانی چاوگ دروست بکات و (٤) یاسا بە نەزۆکی مایەوە.

٢ـ تەنها دوو یاسا توانی دوو چاوگ داڕێژن، ئەویش یاسای ژمارە (١و٦).

٣ـ لە بەر رووناکی خالی (١و٢) چواردە روخساری چاوگ پەیدا بووە.

٤ـ لە ئەو (١٤) چاوگە (٨) روخسار تێپەڕن و(٦) روخسار

تێنەپەڕن.

٥ـ هەموو ئەو چاوگانەی (ێن) هەڵ دەگرن، بەتەنها، تێپەڕن.

٦ـ هەموو ئەو چاوگانەی (ر) یان (ێن+ر) هەڵ دەگرن تێنەپەڕن.

٧ـ هەموو ئەو چاوگانەی کەوا (ر) هەڵ دەگرن تێنەپەڕن و ناتوانن بگۆڕی دەرەکی (بەرکار) وەربگرن هەر لەبەرئەوەیە کەوا یاسای (١١، ١٣، ١٤، ١٦) پووچ بوونەوە.

٨ـ بەرامبەر بە ئەو چاوگە تێنەپەڕانەی کەوا ناتوانن لەگەڵ(بەرکار) دا چاوگ دروست بکەن (خاڵی پێشوو) رێگایەکی تـ هەیە لە زمانەکەدا ئەویش ئەوەیە کەوا (بکەر) دەچێتە جێی (بەرکار)، وەك :

(ناوك) کەوتن، (باوك) مردن، (دڵ) سووتان

(خۆر) (دەر) کەوتن، (پێ) (هەڵ) کەوتن

٩ـ ئەو چاوگانەی کەوا بە (ر)ی بکەر نادیار تێنەپەڕن ناتوانن (بەرکار) وەربگرن بەڵام لە رستەدا (جێگر)ی بکەر هەیە، وەك خاڵی هەشتەم دەتوانن چاوگ دروست بکەن لەگەڵ (جێگری بکەر).

مانگ گیران ـ (مانگ) (گر) (ر) (ا) (ن)

ماف خوران( ماف خوراو) ـ.(ماف) (خو) (ر) (ا) (ن)

١٠ـ بابەتی خاڵی (٨،٩) دوو گیرفانن بۆ خشتەکە و نابێت فەرامۆش بکرێن هەرچەندە کەمن بەڵام تاك و تەرا هەر نموونە دەست دەکەوێت.

١١ـ لە ئەوەدا کەوا دەربارەی چاوگ وترا، بایەخ نەدرا بە (نە)ی نەرێ و بە پاشگری دووپاتکردنەوە (ئەوە) چونکە ئەم دوو کەرەستەیە گشتین پر بە دەم و پر بە نووسین و پر بە رێزمان. هەر چاوگێك یان هەر رێژەیەکی کردار کەوا لەئەم بابەتەوە پەیدا ببن دەتوانن بێ کێشە و بەرە یەکێك لە ئەم دوانە یان هەردوویان پێکەوە وەربگرن و پێناسەی خۆیشیان بپارێزن لە رێزماندا. بە ئەم پێیە (خواردن) و (نەخواردن) و (خواردنەوە) و (نەخواردنەوە) هەر چواریان چاوگی بنچین بەڵام کەرەستە (نەرێ) و (دوولۆیی) هەڵ دەگرن بە پێی پێویستی.

## ٦ـ وشە رۆنان بە پلیکانەی کردار :

پلیکانەی کردار باشترین مەکینەیە بۆ رۆنانی ووشەی زمانەکە بەپێی پێویستی شارستانی. بۆ نموونە ئەوجۆرە وشانە دەتوانن لە پلیکانەکەوە دروست ببن. لە بەشەکانی پێشتردا هەموو روخسارە

جیاوازەکانی چاوگەکە کەوا بە (ناو) دەژمێردرێن لەماتەکانەکە. دابڕێز کراون، ئەم بەشە تایبەتە بۆ ئەو ناوانەی کەوا ئاماژەیان پێکراوە لەم بابەتەدا ناو نەبراون.

ناوی بنجی : ئەم ناوانە بریتین لە بارگەی چینی یەکەم لە پاشکانەکە کەوا بریتییە لە خانەی هەمیشە نەگۆڕی (بنج) بە تەنیایی، وەك :

| | |
|---|---|
| ترسان : ترس | تکان : تك |
| ترشان : ترش | سازان : ساز |
| جەنگان : جەنگ | تاسان : تاس |
| نازین : ناز | لکان : لك |
| لەرزین : لەرز | خەوتن : خەو |
| تەزین : تەز | مژین : مژ |

ئەم میکانیزمە دەتوانێت (بنجی) هەموو چاوگە بنجییەکان ریزبکات و زمانەکە فراوان بکاتەوە. زۆر جاریش بە دووبارە کردنەوەی ئەو بنجانە ووشە دروست دەبێت وەك : ووشەی (نازناز). لە سەر پێوانەی (نازناز) ئەگەر ووترا (خەوخەو) هەموو کەسێك تێدەگات کەوا باسی یەکێك دەکرێت کەوا

زۆر حەز لەخەو دەکات. زۆر جار یەکگرتنی دوو (بنج)

واتایەك دەبەخشێت کەوا نوێباوە وەك (ترس و لەرز: الرعب).

بابەتی ئەم جۆرە ووشانە یەکجار زۆرن ، ئەو نموونانەش بۆ

ئەوە بوو کەوا پردێك دروست بکەین بۆ پەڕینەوە لە کەرەستە و

پلیکانەی وشکەوە بەرەو زمانی تەڕ و پاراو.

ناوی بکەری رانەبردوو : ئەم وشانە لە چینی دوومی پلیکانەکەدا

دروست دەبن، کە بریتی‌یە لە:

(دە) (بنج) (ێن)

روخساری خانەی بەردەوامی بە (ب) دەردەکەوێت و دەبێت بە :

(ب) (بنج) (ێن)

لە ئەم ناوانەدا دیوی (نەرێ) زۆر تەڕ و پاراوە لەسەر زمان بەڵام

دیوی (ئەرێ) نەختێك زبرە :

بترس : نەترس

بگر : نەگر

بلەرز : نەلەرز

لە ئەم ووشانەدا دیسان یاسای ئاوێتە بوون هاتەکایەوە، وەك :

(نە) + (ب) ⟵ (نە)

هەر لەبەر ئەوە خانەی (پ) لە نەرێدا وون بوو. لە ئەو نموونانەدا بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین لە چینی سێیەم (نە) دەخوازین و دەتوانین لە چینەکانی تر بگۆڕە نوێیەکان بخوازین و بڵێین، (بگر، هەڵبگر، لێبگر، بەردبگر) یان (نەگر، هەڵنەگر، لێهەڵنەگر، بەرد لێهەڵ نەگر) ئەمەش ڕێگایەکی فراوانە بۆ فراوان کردنەوەی زمانەکە بەپێی یاسا و بەپێی بیردۆزەی «بگۆڕ و نەگۆڕ».

بەهەمان شێوە بنجە تێنەپەڕەکانیش دەتوانن بکەونە ئیش کردن و بگۆڕی (ێن) هەڵ بگرن :

بکەوێن : نەکەوێن

بمژێن : نەمژێن

بلەرزێن : نەلەرزێن

ئەگەر دیوی (ئەرێ) نەختێك زبر بێت لە سەر زمان بەلام هی ئەوەیە کەوا وشەکە گیانی سەربۆخۆییەکەی هۆگرایەتی پەیدا نەکردووە، کەچی ئەگەر «بەرکار» هات ئەوا ئەوانە زۆر ئاساییین :

بەرد کەوێن :

بەرخ مژێن :

دڵ لەرزێن :

ناوی بکەری رابردوو : ئەم ناوانە گیانی رابردوویی هەیە لە ناویاندا.

ناوی بکەری رابردوو بەئەم هاوکێشەیە پەیدا دەبێت :

رێژەی رابردووی(نزیك) +و = ناوی بکەری رابردوو

ئەم جۆرە ناوە پێویستی نییە بەئەو سێ چینەی ژێرەوە کەوا خانەی (نزیك) هەڵدەگرن. بەتایبەتی چینی چوارەم زۆر بەبرەوە، بەئەم چەشنە :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| (بنج) | (-) | (-) | (نزیك) | و، وەك : سووتاو، گرتوو |
| (بنج) | (ێن) | (-) | (نزیك) | و، وەك : سووتاندو |
| (بنج) | (-) | (ر) | (نزیك) | و، وەك : نووسراو |
| (بنج) | (ێن) | (ر) | (نزیك) | و، وەك : سووتێنراو |

ئەم چوار بنەوانەیە پێنج ناوی رابردوو دەدەن بەدەستەوە و ئەم پێنج ناوەش دەتوانن بگۆڕی دەرەکی وەربگرن، بە تایبەتی (نە) وەك (نەسووتاو، نەگرتوو، نەسووتاندو، نەنووسراو، نەسوتێنراو). یان دەتوانن (پێشگر)یش هەڵ بگرن وەك (داسووتاو، راگرتوو، داسووتاندوو، هەڵ کراو، داسووتێنراو) و لە هەمان کاتدا ئەوانەی کەوا تێپەڕن دەتوانن بەرکار

وەربگرن وەك (پێ گرتوو، دڵ سووتاندوو). لە ئەوناوانەشدا (نووسراو) و(سووتێنراو) بە (ناوی بەرکار) ناو دەبرێن کەچی (جێگری بکەر)ن لە رستەی بکەر نادیاردا.

ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ هەندێك لە ئەو وشانەی کەوا بە یارمەتی پلیکانەی کردار رۆدەنرێن، بەلام رێگاکەش کراوەیە بۆ فراوان کردنەوەی زمانەکە بە هەزاران ووشەی نوێ و داتاشراو بەپێی رێزمان. ئەوەی شایانی باسە هەندێك لە چاوگە بنجی‌یەکان بنجەکەیان رەسەن نی‌یە و لە زمانەکەشدا تواونەتەوە، پاشان بە تەواویش دەچنە سەر پلیکانەی کردار. بۆ نموونە (ئەوتان، خەڵەتان، خنکان، ... ) بنجەکەیان بریتی‌یە لە (فوت، غلط، خنق ...) کەچی جێیان بۆتەوە لە زمانەکەدا و لە رێزمانەکەشدا. ئەم دیاردەیە دەبێت بە رێگایەك بۆ فراوان کردنەوەی ئەو وشە و زاراوانەی کەوا لە رێی زانستەوە دێنە زمانەکەوە. دیاردەی کردار پەیدا کردن دەتوانێت هەر لە ناخی زمانەکەشەوە بێت. باشترین رێگا بۆ ئەم مەبەستە بریتی‌یە لە چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ، واتە بەکارهێنانی پیتی (ا) لە خانەی (نزیك)دا. ئەم چاوگە

دروست کراوانیش لەبەر ئەوەی تێنەپەڕن بگۆڕی ناوەکی (ێن) وەردەگرن و دەروازەیەك دەکەونەوە بۆ کرداری تێپەڕ. ئەگەر سەرنجی ئەو چاوگە بنجی‌یانە بدەین کەوا بنجەکانیان رەسەن نی‌یە دەبینین هەموویان بەرێگای (چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ)ەوە هاتوونەتە زمانەکەوە. هەندێك کرداری تر هەن کەوا رەسەنن بەڵام بەهەمان رێگا پەیدا بوو ـ ون لە زمانەکەدا. ئەم کردارانە ناونراون (چاوگی ئاندن لە دەنگی سروشتی‌یەوە)، وەك (میاواندن، زیڕاندن، لووراندن، گرماندن ...)، ئەم چاوگانە لە بنجی (میاو، زیڕە، لوورە، گرمە)ەوە هاتوون . بێ گومان یەکەم جار بە (میاوان، زیڕان، لووران، گرمان) پەیدا بوو ـ ون پاشان وەرچەرخاون بۆ چاوگی (ئاندن)، بەواتای (میاوکردن، زیڕەکردن، لوورەکردن، گرمەکردن). چاوگی ئەلفی ئەم کردارانە بێ بڕشتە لە زمانەکەدا چونکە تێنەپەڕن و بەڵام چاوگی تێپەڕێنراو بە بڕشتە،کاتێك ئەگەر وترا (گورگەکە لوورا) یان (هەورەکە گرما) ئەوا رستەی منالێك بە بیر دەکەوێتەوە کەوا یەکەم دەردوو رستە بەکاربهێنێت، یان رستەی کەسێك کەوا بە گەورەیی زمانەکە فێر بووبێت. ئەم

ڕێگایە وادەکات کەوا پلیکانەکە وەك مەکینەیەك بکەوێتە کار لە سەر هەر ووشەیەك بکرێت بە (بنج) و بخرێتە نێو خانەی بنجەوە.

ئەوەی لێرەدا باس کرا کۆتایی ڕێگاکە نییە بەڵکو سەرەتاکەیەتی چونکە چەندین وشە لە زمانەکەدا پێویستە، وەك ناوی شوێن، ناوی کەرەستەو ئامێر، ناوی کات، ناوی ئەو زاراوانەی کەوا لەرۆی تەکنەلۆژیای سەردەمەوە دێنە زمانەکەوە. زمانەکەش دەوڵەمەندە بەچەندین وشەی دروست کراو لەسەر ئەندازە، وەك دەڵێین (کردەی من و بردەی شەماڵ) لێرەدا ناوی (کردە) ئەو کارانەیە کەوا دەکرێن و ناوی (بردە) بۆ شتی براو. بەڵام پێیە دەتوانین چەندین وشە ریزبکەین لەسەر ئەندازەی ئەو دوو ووشەیە، وەك (شوردە، گرتە، ناردە، بژاردە، هەڵبژاردە، ژماردە، سپاردە، راسپاردە، ...).

وەکو کۆتاییەك بۆ ئەم بەشە دەتوانین بڵێین ئەو وشانە بە ڕێگایەکی هەرەمەکی رۆنەنراون بەڵکو لە کرۆکی پلیکانەی کردار پەیدا بوو ـ ون. بۆ نموونە (ناوی بکەری رابردوو)

کەوا هەموو کاتێك پیتی (و) وەردەگرێت وەك پیتی کۆتایی ئەو پیتە بریتی‌یە لە پیتی رابردوو لە (بوون) دا، لەسەر ئەو راستی‌یەی کەوا خانەکانی (ـ٤) و (ـ٥) بریتین لەریزەکانی (بوون)، بۆنموونە :




لە ئەوریزەدا (و) بریتی‌یە لە پیتی رابردوو لە چاوگی (بوونی یاریدە) بەلأم گۆ نەکردنی بنجەکەی (ب) وا دەکات کەوا هەموو ناوێکی بکەری رابردوو واتای رابردوویی و ئێستایی ببەخشێت ـ ئەمانەش هەمووی لە ریزمانی (بوون و هەبوون) دا بێ گومان شیتەڵ دەکرێنەوە .




وێنە ١٥ . بلۆگە خانەکانی پلیکانەکە


بنج
ده
ین
نه
ر
هەڵ
نزیك
لێ
دوور
بەرکار
مەبەست
بنجی
چاوگی سادە
چاوگی دارێژراو
چاوگی لێکدراو
ن
چاوگ = [بەرکار] [پێشگر] [بنج] [ین] [ر] + [نزیك] + [ن]

وێنەی ١٦

| | بگۆڕی دەرەکی | | نەگۆڕ | بگۆڕی ناوەکی | | پێی ڕابردوو | ن | چاوگ | هێز |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بەرکار | پێشگر | [ڕەگ] | ێن | ر | | | | |
| ١ | - | - | نووس | - | - | ی | ن | نووسین | تێپەڕ |
| ١ | - | - | سووت | - | - | ا | ن | سووتان | تێنەپەڕ |
| ٢ | - | - | سووت | ان | - | د | ن | سووتاندن | تێپەڕ |
| ٣ | - | - | نووس | - | ر | ا | ن | نووسران | تێنەپەڕ |
| ٤ | - | - | سووت | ێن | ر | ا | ن | سووتێنران | تێنەپەڕ |
| ٥ | نامە | - | نووس | - | - | ی | ن | نامە نووسین | تێپەڕ |
| ٦ | - | هەڵ | گر | - | - | ت | ن | هەڵ گرتن | تێپەڕ |
| ٦ | - | دا | شك | - | - | ا | ن | داشکان | تێنەپەڕ |
| ٧ | بەرد | هەڵ | گر | - | - | ت | ن | بەرد هەڵ گرتن | تێپەڕ |
| ٨ | بەرد | - | شك | ێن | - | د | ن | بەرد شکاندن | تێپەڕ |
| ٩ | - | دا | شك | ان | - | د | ن | داشکاندن | تێپەڕ |
| ١٠ | دار | دا | شك | ێن | - | د | ن | دار داشکاندن | تێپەڕ |
| ١١ | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٢ | - | هەڵ | گر | | ر | ا | ن | هەڵ گیران | تێنەپەڕ |
| ١٣ | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٤ | - | - | - | - | - | - | - | - | - |
| ١٥ | - | هەڵ | کەو | ێن | ر | ا | ن | هەڵ کەوێنران | تێنەپەڕ |
| ١٦ | - | - | - | - | - | - | - | - | - |

خشتەی -٩- جۆرەکانی چاوگ

# بەشی شەشەم

# بگۆڕ و جێگۆڕ لە ڕیزی ڕستەدا

## ١- سەرەتایەك بۆ ڕستە:

لە ڕستەی زمانی کوردیدا ئەم ڕیز بوونە هەیە بۆ کرداری تێپەڕ :

(بکەری جودا + بەرکاری جودا + کردار + بکەری لکاو)

لە ئەم ڕیز بوونەدا:

١- بکەری جودا دەتوانێت هەبێت یان نەبێت بەڵام «بکەری لکاو» بەردی بنەڕەتی ڕستەیە. و هەموو کاتێك بە (دیار و نادیار) هەر هەیە. واتە ڕستە بێ (جێناوی لکاوی بکەر) ڕۆنانرێت.

٢- بەرکاری جودا دەتوانێت هەبێت یان جێگیر بکرێت بە (جێناوی لکاوی بەرکار)، ئەم دوو کەرەستەیە هەر یەکێکیان دەتوانێت هەبێت لە ڕستەکەدا. هەر لەبەر ئەوەیە کەوا «بەرکاری لکاو» لە ڕیزەکەدا نیشانە نەکراوە. لە ڕستەی تێنەپەڕدا بەگشتی بەرکار (چی جودا، چی لکاو) لە ڕیزی ڕستەکەدا نییە.

٣- ئەو ڕیزە بۆ ڕستەیەکە کەوا (ڕاستەوخۆ و بێ ئامرازی پەیوەندی) بێت. ئەم بابەتە لە کاتی خۆیدا باس دەکرێت.

٤ـ کردار بریتی‌یە لە (نەگۆڕ و بگۆڕ) ، واتە:

کردار = نەگۆڕ + بگۆڕ

تەنها نەگۆڕ لەکرداردا بریتی‌یە لە (بنج) کەپێی دە ووتریت ڕەگی چاوگی بنجی. بەلام بگۆڕ دوو جۆرن، بگۆڕی دەرەکی و بگۆڕی ناوەکی، ژمارەی ئەم دوو خێزانە بگۆڕە بریتی‌یە لە (١٠)، بەس بەنیوەیی، واتە:

کردار = (بنج) + (١٠) بگۆڕ

یان :

کردار =(بنج)+(٥ بگۆڕی ناوەکی)+(٥ بگۆڕی دەرەکی)

یان :

کردار = (٥) پێشکار + (ڕەگ)،

چونکە :

ڕەگ = بنج + (٥) پارچۆلکەی بگۆڕی ناوەکی

یان :

بگۆڕی دەرەکی = پێشکار.

لێرەدا، جێناوی لکاوی بکەرو بەرکار پشتی «ڕەگ» دەگرن لە هەموو ڕستەیەکدا و بە (داخزین) دێنە پێشەوە ئەگەر هەر بگۆڕێکی

ناوەکی نەما لە رستەکەدا. ئەم داخزینە پیادە دەکرێت تا جێناو
لکاو دەگات بە (بنج). لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بگۆڕی دەرەکی
هەبوو ئەوا یاساکانی جێگۆرکی پیادە دەکرێت.

٥- ئەگەر کردارەکە تێنەپەڕ بوو، تێنەپەڕ لە بنجەوە یان تێنەپەڕ
بکەر نادیار، ئەوە گیانی بەرکاری راستەوخۆ نامێنێت و ره
بوونەکە بە ئەم چەشنە کرژ دەبێتەوە:

(بکەری جودا + کردار + بکەری لکاو)

٦- ئاڵۆزترین باری رستەی راستەوخۆ ئەو بارەیە کەوا لەرستە
تێپەڕدا بەرکارەکە لکاو بێت. لە هەموو رستەیەکدا ئەم میکانیز
هەیە: «وێنەی ١٧».

٧- لە رانەبردوو و فەرماندا، بەرکار هەر دەکەوێتە پێش بکە
لکاو. ئەم میکانیزمە ئەم راستیە دەردەخات :

(بەرکار «چی جوودا، چی لکاو») پاشان (بکەری لکاو)

٨- ئەگەر رستەکە «رانەبردوو» یان «فەرمان» بوو، یان «بەرکا
نەبوو تێیدا، ئەوا :

(بکەری لکاو) پەیوەستە بە (رەگی کردار)ەوە

٩- ئەگەر رستەکە رابردوو و تێپەڕ بوو ئەوا :

گەرمیان : (بەرکار «چی جودا، چی لکاو» و (بکەری لکاو)، پێکەوە پەیوەستن.

کوێستان:(بەرکاری جودا)پاشان(بکەری جودا)،یان(بکەری لکاو)، پاشان (بەرکاری لکاو).

لەبەرئەنجامی ئەم بەشەدا دەتوانین بیر خەست بکەینەوە و ئەم خالآنە بخەینە بەر دەست، (بێ گومان سەبارەت بە رستەی راستەوخۆ) :

یەکەم : رستەی بێ‌جێناوی لکاو دروست نابێت.

دووەم : ئەگەر یەك جێناوی لکاو هەبێت ئەوا ئەو جێناوە یان بکەری لکاوە یان جێگری بکەری لکاوە.

سێیەم : لە بەر رووناکی ئەو دوو خالە دەتوانین بلێین، هەبوونی بکەری لکاو بریتی‌یە لە (چاری ناچار) بەلآم هەبوونی بەرکاری لکاو بریتی‌یە لە (کاری خۆ ویست) بەشێوەی سەربار. رستەی کاری (چاری ناچار)، بێ گومان سەرەتاو یەکەم پلەی رستەیە بەلآم رستەی جۆری دووەم سەرەتا نی‌یە و پلەی دووەمە لە پلیکانەی ئالۆزکانی رستە.

## ٢- جێ گۆڕ و جێ نەگۆڕ :

وەکوو لە پێشتردا باس کرا، (بگۆڕ) بەپێی پێویستی گوفتار هەیە لە رستە و کردار دا و (نەگۆڕ)یش ئەو خانەیە یە کەوا هەیە و بارگە دارە. ئەو کەرەستانە ناتوانن جێ گۆڕکێ بکەن و هەموو کاتێك ئەگەر هەبن هەر لە خانەکەی خۆیاندا چالاکن، بەلاّم زۆر جار هەندێك کەرەستە هەن کەوا جێ دەگۆڕن و جێ گۆڕینەکەش رەفتارێکی رێزمانیی‌یە و دیاردەیەکی میکانیزمی و جێدارە. جێ گۆڕین لە رستەدا سێ رێگای هەیە :

رێگای یەکەم : جێ گۆڕینی خۆ کرد : وەك جێگا گۆڕینی خانەی (ئامرازی پەیوەندی) بۆ پاش (رەگ) یان بە پێچەوانەوە. ئەم جێ گۆڕینە خۆویستە لە هەموو رستەیەکدا پیادە دەکرێت, تەنانەت دەتوانین لەهەموو نووسینێکدا ئەم دوو جێگایە بەکار بهێنین . زۆر جار لەیەك برگەی نووسیندا نووسەر بەهێ ئاگایی ئەم دوولایی‌یە دەخاتە روو.ئەم دوو جێ‌یە هەر دەبێت یەکێکیان رەسەن بێت یان بەجێ‌تر بێت. جێگای پێش رەگ کۆمەڵێك نەخۆشی دەخاتە نێو رستەوە و کۆمەڵێك میکانیزمی ناهەموار دروست دەکات.ئەگەر جێگای پاش رەگ بەکار هات ئەوا ئەو کۆمەڵە نەخۆشی و

ناهەمواریە هەڵم دەکەن و نامێنن لە رستەدا. بە بۆچوونی ئێمە جێگای پاش رەگ رەسەنترە و رێزمانیترە و بەجێترە وەك لە زۆر جێی تردا دیاری کراوە.

رێگای دووەم : جێگۆڕینی ناوچەیی : وەك (ئەرك گۆڕکێی جێناوی لکاو) لە شێوەی ئاخاوتنی کوێستاندا. ئەم دیاردەیە خۆی لە خۆیدا رێگایەکە بۆ دەربازبوون لە جێگۆڕکێ و لە کۆمەڵ بوونی چەند جێناوی لکاو لە کونجێکی رستەدا. ئەم دیاردەیە هەر پەرەدەسێنێت و لە ناوچەییەوە دەبێت بەگشتی.

رێگای سێیەم : جێگۆڕینی گشتی، یان جێگۆڕینی خۆنەکرد و پیادەکراو لە رێزمانی زمانەکەدا بەگشتی وەك جێگۆڕکێی بکەرو بەرکار ، رستەیەك ئەم جێگۆڕکێیە پیادە نەکات.بەپێی هەل و مەرج، ئەوا بە دەروازەی زمانەدا تێناپەڕێت.

پاش دیاری کردنی ئەم سێ رێگایە دەتوانین کاکڵەیەك بدۆزینەوە. ئەویش ئەوەیە کەوا جێگۆڕ و جێنەگۆڕ دوو زاراوەن کەوا بە جێناودا دەچەسپێن، بەدیاری کراویش بەسەر جێناوی لکاودا، بەئەم چەشنە :

یەکەم : لە هەموو کرداری زمانەکەدا ریزە جێناوی (م، ت،

ی، مان، تان، یان) جێگۆڕن لە ئەرکی بکەرو بەرکاردا.

دووەم : لە کرداری تێنەپەڕدا هەر بکەر هەیە و بکەرێ
(جێنەگۆڕ) ە.

سێیەم : لەکرداری (بکەری نادیار) دا (بەرکار) دەبێت ب
(جێگری بکەر). ئەم کەرەستەیەش بکەری لکاوی هەیە ،
ئەمیش (جێنەگۆڕ) ە.

چوارەم : (بکەری لکاو) تەنها لە رستەی رابردوودا ول
کرداری تێپەڕدا (جێگۆڕ) ە و لە هەموو بارەکانی ترا
(جێنەگۆڕ) ە.

پێنجەم : لە [illegible] [illegible]یان دا، بەرکاری لکاو لە هەمو
جێیەك هەر جێ[illegible]. [illegible] (رێگای دووەم)، تەنها ل
رانەبردوودا [illegible] (نادیار) نەبوو ئەوا بەکارە
لکاو دە[illegible] [illegible]ێتەوە بۆ جێی خۆی و ب
ناچاری دە[illegible] بەر [illegible]ی ئەرکگۆڕکێ. ئەم دیاردە
هەموو ستوونە جێناو[illegible]، لە چەشنی (م، ت، ی، مان، تان،
یان)، دەگرێتەوە لە دەمکاتی رابردوودا و لە کرداری
تێپەڕدا.

وەکوو کورتەیەك بۆ ئەم بەشە دەتوانین ئەم چەند راستی‌یە دیاری بکەین دەربارەی ریگای سێیەم بۆ جێگۆرکێی (بکەر و بەرکار).

١- لە هەموو رستەی زمانەکەدا جێگای بکەر و بەرکاری لکاو دەکەوێتە پاش رەگی کردار، واتە ئەو جێیە جێگای رەسەنە بۆ جێناوی لکاو.

٢- لە هەموو رستەی زمانەکەدا ئەگەر پێشکار هەبوو ئەوا ریزە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) دادەماڵرێت بۆ سەر یەکەم پێشکار، بەئەم چەشنە :

(بەرکار)(ئامراز)(هەڵ)(نە)(دە)(پلیکانەی رەگ)(-)(بکەر).

٣- تەنها لە رابردوودا و تەنها لە ئاخاوتنی گەرمیاندا،(بکەری لکاو) پەیوەست دەبێت بە بەرکارەوە لە هەموو جێیەك.

٤- بە پێی ئەو راستی‌یەی کەوا رێژەی رابردوو و فەرمان لە کورتترین روخساردا لە پێشکاری بەردەوامی و بنج پێك هاتوون، ناتوانین خانەی بەرکاری لکاو بە پری ببینین بەچاو،چونکە لە رانەبردوو و فەرماندا ناتوانین پێشکاری بەردەوامی لابەین، وەك :

(بەرکار)(ئامراز)(ـ)(هەڵ)(ـ)(نە)(ـ)(دە)(ـ)( رەگ)(ـ)(ـ)(بکەر).

٥ـ بەپێی خاڵی (٢) و (٣) لە رابردوودا هەردوو خانەکە بەیەکەوە جێگۆڕکێ دەکەن، وەك :

(بەرکار) (ـ) (ئامراز) (ـ) (ـ) (نە) (ـ) (ـ) (رەگ) (ـ) (ـ) (ـ).

٦ـ لە رابردووی بەردەوامدا خاڵی (٤) دەچەسپێت بۆ (بەرکار) و خاڵی (٥) دەچەسپێت بۆ بکەر، وەك :

(٥)(ـ)(٤)(ـ)(ـ)(هەڵ)(ـ)(ـ)(نە)(ـ)(ـ)(دە)(ـ)(ـ)(رەگ)(ـ)(ـ)(بکەر).

٧ـ هەرچەند بۆ کەسی سێیەمی تاك لە رابردوودا بەرکاری لکاو(نادیار) بوو، ئەوا ناوەڕۆکی ئەم بەشە بەراویتە نابێت و میکانیزمی جێگۆڕکێ وەك خۆی دەچەسپێت.

٨ـ لە کرداری رابردوودا (خاڵی ٥ و ٦) ئەگەر هەڵ و مەرجی ئەرك گۆڕکێ هاتە کایەوە ئەوا(بەرکاری لکاو) دەگەڕێتەوە، پاش رەگ، وەك :

(٥)(ـ)(٤)(ـ)(ـ)(هەڵ)(ـ)(ـ)(نە)(ـ)(ـ)(دە)(ـ)(ـ)(رەگ)(ـ)(ـ).

٩ـ جێگۆڕینی ناوچەیی، ناوبراو لە خاڵی (٨) دا، هەر بۆ جێگۆڕینی گشتیی بکەرو بەرکار نییە. ئەم جێگۆڕینە ناوچەییە، شەپۆلەکەی گەیشتووە بە جێناوی تەواوکەریش.

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێین جێگۆڕکێ مۆرکێکی رەسەن و تایبەتی زمانەکەیە. زمانەکەیش زۆر حەز لە جێگۆڕکێ دەکات بەرەو سەرەتای رستە. بۆ نموونە پاشگری دووپات (ەوە)، بە هەرەمەکی لە هەندێك شوێندا جێگۆڕکێ دەکات، وەك :

«سوور کردنەوە ــ سوور (ەوە) کردن (ـ)».

## ٣ـ دەمکاتی کردار لە رستەدا :

لە وێنەی ژمارە (١٨) دا، ئەگەر بڕوانین لە پلیکانەی کردار دەبینین سێ ناوچە دیاری کراوە بەرامبەر بە هەر سێ دەمکاتەکەی رستە کەبریتین لە :

١ـ رێژەی فەرمان

٢ـ دەمکاتی رانەبردوو

٣ـ دەمکاتی رابردوو

ئێستاش دەتوانین هەر ناوچەیەك لە ئەمانە شیتەڵ بکەینەوە ئەگەر

ئەم سێ بگۆڕە بۆ بایەخ بکەین، وەك :

١- بگۆڕی (نە) ئەم بگۆڕە گشتییە لە هەموو ڕێژە و دەمکاتێکدا دەتوانێت هەبێت یان نەبێت و هیچ کەرەستەیەکی تر ناتوانێت ڕەوت تێك بدات لێی.

٢- بگۆڕی (ئامرازی پەیوەندی)، ئەم بگۆڕە، لەگەڵ ئەوەدا کەوا بارگەی لکاو و بارگەی گران و ئاڵۆز هەڵدەگرێت، نەگۆڕیشە و دەتوانێت جێگا بگۆڕێت و لە پلیکانەی کردار ئازاد ببێت.

٣- بگۆڕی (بەرکار)، لەبەر ئەوەی بەشێکی سەربارە لە کرداری تێپەڕ و سەرەڕای ئەوەش جێگۆڕە ئەگەر بە جێناوی لکاو جێگیرکرا.

ڕێژەی فەرمان :

لە دەمکاتی فەرماندا دوو شت نەگۆڕن :

١- خانەی نەگۆڕی هەمیشەیی (بنج).

٢- خانەی بەردەوامی، کەوا هەر هەیە بەڵام بە ڕوخساری (ب).

ئێستاش ناوچەی فەرمان وەردەگێرین و یەکالای دەکەینەوە. پاش ئەوەی بگۆڕی (نە) و بگۆڕی (ئامرازی پەیوەندی) و بگۆڕی بەرکار

لابدەین، روخساری پلیکانەکە بەئەم چەشنە کورت دەبێتەوە :

(هەڵ) (ب) (بنج) (ێن)

ـ نەگۆڕ ـ

لە ئەم پلیکانەیەدا چەند راستی‌یەك هەیە و دەبێت لێرەشدا دووبارەیان بکەینەوە :

١ـ پێشکاری (بەرکار) بگۆڕە دەتوانێت هەبێت یان نەبێت و ئەگەر هەبوو (جێ‌نەگۆڕ)ە.

٢ـ نەگۆڕی (ب) ئاوێتە دەبێت لەگەڵ (نە) دا.

٣ـ کورتترین رستەی فەرمان هەر دوو نەگۆڕ هەڵ دەگرێت، (ب) + (بنج). بەڵام میکانیزمی دروست بوونی روخسارەکان بە ئەم چەشنەیە :(بڕوانە بۆ خشتەی ١٠ بۆ نموونەکان).

١ـ (ب) + (بنج)

٢ـ (ب) + (بنج) + (ێن)

٣ـ (پێشگر) + (ب) + (بنج)

٤ـ (پێشگر) + (ب) + (بنج) + (ێن)

## دەمکاتی ڕانەبردوو :

ناوچەی ڕانەبردوو لە پلیکانەی کردار وەر دەگرین و یەکالای دەکەینەوە. پاش ئەوەی بگۆڕی (نە) و بگۆڕی (ئامرازی پەیوەندی) و بگۆڕی (بەرکار) لابدەین:

(دە) (بنج) (ێن) (ر)

(هەڵ) (دە) (بنج) (ێن) (ر)

نەگۆڕ

لە دەمکاتی ڕانەبردوودا دووشت نەگۆڕن :

١- خانەی نەگۆڕی هەمیشەیی (بنج).

٢- خانەی بەردەوامی نەگۆڕە و هەر هەیە بەڵام بە دوو بارگە، یەکەمیان (دە) بۆ ڕستەی ئاشکرا، دووەمیان (ب) بۆ ڕستەی نیازداری و گومانداری.

ئەم دوو نەگۆڕە پڕ بەپڕ ڕەفتاری ڕانەبردوو و فەرمان لە یەك نزیك دەکەونەوە. بەڵام بۆ ڕانەبردوو چەند ڕاستی‌یەك هەیە و دەبێت دووبارەیان بکەینەوە:

١- پێشکاری (بەرکار) هەرچەندە بگۆڕە بەڵام جێگۆڕیشە ئەگەر بە جێناوی لکاو جێگیر کرا.

٢- نەگۆڕی بەردەوامی لەگەڵ (نە)ی نەرێدا ئاوێتە دەبێت.

٣ـ كورتترین رستەی رانەبردوو هەر دوو نەگۆڕی (دە) و (بنج) هەڵدەگرێت.

٤ـ لە ئەم دەمكاتەدا بگۆڕی بكەر نادیاریش دەر دەكەوێت.

ئێستاش میكانیزمی دروست بوونی روخسارەكانی دەمكاتی رانەبردوو دەردەخەین. بەپێی ئەم پلیكانەیە ئەم یاسانە دروست دەبن. (بڕوانە بۆ خشتەی ١١ بۆ نموونەكان) :

١ـ (دە) + (بنج)

٢ـ (دە) + (بنج)+(ێن)

٣ـ (دە) + (بنج)+(ر)

٤ـ (دە) + (بنج)+(ێن)+(ر)

٥ـ (پێشگر) + (دە) + (بنج)

٦ـ (پێشگر) + (دە) + (بنج) + (ێن)

٧ـ (پێشگر) + (دە) + (بنج) + (ر)

٨ـ (پێشگر) + (دە) + (بنج) + (ێن) + (ر)

دەمكاتی رابردوو :

لە دەمكاتی رابردوودا دووشت نەگۆڕن :

١- خانەی هەمیشە نەگۆڕ (بنج)

٢- خانەی پیتی رابردووی نزیك (نزیك). ئەم خانەم

بارگەکەی بریتی‌یە لە ئەم پێنج پیتە (ا، د، ت، ی، و).

ئەم دوو نەگۆڕە لە هەموو رابردوویەکدا هەن.هەرچەندە رابردوو

وەك رانەبردوو و فەرمان، یەك جۆر نی‌یە. بۆ پێویستی لێکۆڵینە

هەر جۆرێك لە رابردوو بە جوودایی وەردەگرین :

١- رابردووی نزیك : لە ئەم رابردوەدا، خانەی بەردەوامی (دە)،

خانەی رابردووی دوور هەر نین بە ئەم چەشنە، روخساری پلیکانە

کورت دەبێتەوە :

| (بنج) | (ێن) (ر) | (نزیك) |

(هەڵ) | (بنج) | (ێن) (ر) | (نزیك) | (مەبەست)

نەگۆڕ

لە ئەم رابردووەدا ١٦ یاسا دروست دەبن، وەك :

١- (بنج) + (نزیك)

٢- (بنج) + (ێن) + (نزیك)

٣- (بنج) + (ر) + (نزیك)

٤- (بنج) + (ێن) + (ر) + (نزیك)

٥- (بنج) + (نزيك) + (مەبەست)

٦- (بنج) + (ێن) + (نزيك) + (مەبەست)

٧- (بنج) + (ێن) + (نزيك) + (مەبەست)

٨- (بنج) + (ێن) + (ر) + (نزيك) + (مەبەست)

٩- (پێشگر) + (بنج) + (نزيك)

١٠- (پێشگر) + (بنج) + (ێن) + (نزيك)

١١- (پێشگر) + (بنج) + (ر) + (نزيك)

١٢- (پێشگر) + (بنج) + (ێن) + (ر) + (نزيك)

١٣- (پێشگر) + (بنج) + (نزيك) + (مەبەست)

١٤- (پێشگر) + (بنج) + (ێن) + (نزيك) + (مەبەست)

١٥- (پێشگر) + (بنج) + (ر) + (نزيك) + (مەبەست)

١٦- (پێشگر) + (بنج) +(ێن)+(ر)+(نزيك)+(مەبەست)

بەم چەشنە (١٦) ياسا پەيدا بوو بۆ رابردووى نزيك، ئێستاش ئەو ياسانە نموونە رێز دەكەين لە خشتەيەكدا، (خشتەى ١٢) :

رابردووى بەردەوام : لە ئەم رابردووەدا، خانەى بەردەوامى (دە)

هەیە و بەلاّم لە رستەی نیاز و گوماندا دەبێت بە (ب). بۆ رابردووی بەردەوام هەمان خشتە وەردەگرین و بگۆڕی (دە) دەخەیـ پێش (بنج)، بۆ رستەی ئاشکرا و بگۆڕی (ب) یش بۆ رستەی نیاز و گومان. بەم پێیە شانزە یاسا پەیدا دەبێت وەکوو بۆ رابردوو وەکو بۆ رابردووی نزیك و ئەم هاوکێشەیەش دەبێت بە بنەوانە :

رابردووی بەردەوام = بگۆڕی (دە / ب) + رابردووی (نزیك)

یان :

کورتترین روخسار = بگۆڕی (دە) + («بنج» + «نزیك»)

<u>رابردووی دوور</u> : لەئەم رابردووەدا بگۆڕی (بوو) پەیدا دەبێت لەجێگای ئەندازەیی خۆیدا،واتە یەکسەر پاش خانەی رابردووی (نزیك). ئەم رێژەیە بەهیچ جۆرێك بگۆڕی بەردەوامی (دە) وەرناگرێت لەئەم رێژەیەش (١٦) یاسا پەیدا دەبێت و خشتەی (١٢) دووپارە دەبێتەوە. هاوکێشەی ئەم رابردووە بە ئەم چەشنەیە :

رابردووی دوور = رابردووی (نزیك) + (بوو)

یان :

کورترین روخسار = («بنج» + «نزیك») + (بوو)

رابردووی تەواو : لەئەم رابردووەدا تەنیا خانتی(دوور) بارگەی (و) هەڵ دەگرێت لەجیاتی (بوو)ی رابردووی دوور. ریزمانی ئەم رێژەیە نەختێك لایەنی تایبەتی هەیە، هەر لەبەر ئەوە نامانەوێت لێرەدا بیخەینە روو. ئەم بابەتە لەگەڵ رێزمانی کرداری (بوون و هەبوون)دا ریز دەکرێت.

ئێستاش وەکوو کورتەیەك دەتوانین کورت ترین روخساری هەر دەمکاتێك دیاری بکەین :

فەرمان : (ب) + (بنج)

رانەبردوو : (دە/ب) + (بنج)

رابردووی نزیك : (بنج) + (نزیك)

رابردووی بەردەوام : (دە/ب) + (بنج) + (نزیك)

رابردووی دوور : (بنج) + (نزیك) + (بوو)

رابردووی تەواو : (بنج) + (نزیك) + (وو)

## ٤ـ بگۆڕ و نەگۆڕ لە رستەدا :

لە زمانەکەدا، رستە زۆر ئالۆزە و زۆر وردەکاری هەیە تێیدا بەڵام لە سەرەتاوە دەتوانین بڵێین کەوا کەرستەکانی رستە دوو جۆرن، ئەویش جۆری بگۆڕ و جۆری نەگۆڕ :

یەکەم ـ نەگۆڕ : تەنها دوو کەرستە لە رستەی زمانەکەدا نەگۆڕن :

١ـ کرداری رستەکە : لە هەموو رستەیەکی زمانەکەدا کردار هەیە .

٢ـ بکەری لکاوی رستە : لە رستەدا ئەگەر بکەری جوداش هەبێت بەڵام بگۆڕە و رستە دەتوانێت بە ئاسانی دەرباز بێت لێی.

خاڵی یەکەم واتای ئەوە دەبەخشێت کەوا رستە بێ کردار نابێت. بەشێک رەخنەگران روو وەر دەگێرن بۆ کرداری (بوون و هەبوون). ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین ئەم جۆرە کردارە هەر کردارن هەرچەندە گیرفانێکی تایبەتیان هەبێت لە رێزمانی زمانەکەدا سەبارەت بە خاڵی دووەم، بکەری لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك، لە کرداری تێنەپەری رابردوودا (نادیار)ە و نادیاریش واتای ئەوە نییە کە (نەبوو) بێت. ئەم دیاردەیە باری ئەم بابەتە لاسەنگ ناکات.

دووەم ـ بگۆڕ : سەبارەت بە بگۆڕی رستە هەموو کەرستەیەکی تری رستە، بێجگە لە ئەو دوو نەگۆڕە، بگۆڕن. ئەم کەرستانە ژمارەیان زۆرە و هەمەجۆرن، وەك :

١ـ بەرکاری رستە : ئەم بگۆڕە :

ـ تەنها هەر لە کرداری تێپەڕدا هەیە و لە کرداری تێنەپەڕدا نییە.

ـ ئەم بگۆڕە ئەگەر هەبێت یان بەروخساری جو دا (بەرکاری نەلکاو) یان بەروخساری لکاو (بەرکاری لکاو) دەردەکەوێت.

ـ بەرکاری لکاو دەتوانێت (نەبوو)بێت لە رستەی رانەبردوو و فەرماندا. وەك :

(دەی خۆم : دەخۆم، یان بیخۆ : بخۆ).

بەپێی ئەم سێ خاڵە ناتوانین بەرکاری نەلکاو یان لکاو بە «نەگۆڕ» دابنێین.

٢ـ بکەری نەلکاو : ئەم بگۆڕە نوێنەری نەگۆڕی هەیە لە رستەدا و خۆی بگۆڕە و بەپێی پێویست رستە فەرامۆش دەکات.

٣- ئامرازی پەیوەندی : ئەم بگۆڕە لە زۆر رستەدا هەر پێویست نی‌یە نەخۆی نەخۆی و بارگەکەی. بارگەی ئامرازی پەیوەندی لە خانەی (ئامراز)دا بریتی‌یە لە بەرکاری ناراستەوخۆ بێ‌گومان ئەم کەرەستەیەش بگۆڕە.

بەکورتی دەتوانین بڵێین رستەیەك هەیە کەوا بنجی بێت و ئەو رستەیەیش بریتی‌یە لە دوو نەگۆڕی رستە (کردار و بکەری لکاو)، وەك :

(دەڕۆم،دەشکێنم،هەڵم‌نەگرت،ڕۆیشتم،کەوتیت،سووتابوو)

ئێستاش ئەگەر بیر خەست بکەینەوە لە سەر ئەو کردارانەی نێو نموونەکان دەبینین بگۆڕی ناوەکی (ێن، ت، ا، بوو) و بگۆڕی دەرەکی (هەڵ، دە، نە) هەڵ دەگرن. سەبارەت بە لابردنی ئەو بگۆڕانە بەگشتی لە کردارەکە،

کورتترین رستە، ئەو رستەیەیەکەوا لە کردار و بکەری لکاو پێك هاتەوە و لە هەمان کاتدا کردارەکە یەك بگۆڕی ناوەکی یان یەك بگۆڕی دەرەکی هەڵگرتووە، وەك :

(ده) (رۆ) «م» ، (ده) (نێر) «يت»

(ب) (گر) «ه» ، (ب) (كەو) «ن»

بگۆڕە ناوەكی‌یە كەش، بە دیاری كراوی بریتی‌یە لە پیتی رابردوو (ا، د، ێ ی، و) لەكرداری تێنەپەڕی بنجی لە دەمكاتی رابردووی نزیكدا، وەك:

(كەو) (ت) «ين» ، (مر) (د) «ن»

(سووت) (ا) «ـ» ، (لەرز) (ی) «يت»

لێرەدا رابردووی نزیكی كرداری تێپەڕی بنجی دەست نادات چونكە هەموو كردارێكی تێپەڕی رابردەو گیانی بەركاری كەسی سێیەم هەڵ دەگرێت بە نادیاری وبەركاریش لەئەم بابەتەدا بە بگۆڕ ناسراوە.

ئەمە بوو بنجی ترین و كورت ترین رستەی زمانەكە، بەڵام لەناو ئەمانەشدا كورت تر هەیە. ئەوەش ئەوەیە كەوا بۆ كەسی سێیەمی تاك بكەریش نادیارە و رستەكە پلەیەتر كورت دەبێتەوە لە نووسیندا، وەك:

(سووت) (ا) «ـ» ، (كەو) (ت) «ـ»

(مـــر)(د) «ـ» ، (لەرز) (ی) «ـ»

لەکۆتاییدا دەڵێین ئەم رستانە یەکەم پلەن لە پلیکانەی رستە وپلیکانەش یەك پلە نییە وبریتییە لە چەندین پلەی ئەندازەیی و یەك لە دوای یەك. ئای بۆ چەند کەسانێکی دڵسۆز کەوا ببن بە دارتاشی ئەو پلیکانەیەی کەوا لە زمانی هاوچەرخدا زۆر زۆر پێویستە بۆ سەدەی بیست و یەکەم، (نوخشانەی بەخێر).

## ٥- ناخی رستە و رۆخی رستە :

لە بەشەکانی تری ئەم نووسینەدا، ووتمان کەوا رستەی زمانەکە دەتوانێت چوار شێواز دەربخات لە گوفتاردا، لە روی مەبەستەوە، وەك :

١- رستەی ئاشکرا

٢- رستەی فەرمان

٣- رستەی نیاز، (نیازداری)

٤- رستەی گومان، (گومانداری)

هەموو رستەیێك دەتوانێت مەبەستێك هەڵبگرێت بە (ناخ) بەڵام تەنها رستەی فەرمان و نیاز و گومان دەتوانن دەربکەون

بە (ڕۆخ). لێرەدا دەرکەوتن بە (ڕۆخ)، بە واتای (لادان لە ڕوخساری ڕستەی ئاشکرا)، هاتووە. هەموو مەبەستێکی تر کەوا لە ناخی بەکار هێنەری ڕستەدا شاراوە بێت دەتوانێت بە (مچورك و ئاوازە)ی ڕستەکە دەست نیشان بکرێت.

لە ریزی بگۆڕ و نەگۆڕی کرداردا کەوا ژمارەیان دەکات بە یانزە پارچۆلکە تەنها دوو پارچە دەتوانن مەبەستی «ناخ» لە (فەرمان و نیازو و گومان) بخەنە سەر ڕۆخی کردار بە ڕوخساری ئاشکرا، وەکوو لە ئەم ریزەدا دیاری کراوە :

(بەرکار)(ئامراز)(هەڵ)(نە)(دە)(بنج)(ێن)(ر)(نزیك)(دوور)(مەبەست)

لە هەموو دەمکاتێکدا ئەم دووخانەیە، خانەی بەردەوامی (دە) و خانەی (مەبەست)، دەتوانن لە ڕۆخی ئاشکرای ڕستەدا هەبن ئەگەر (فەرمان) یان (نیاز) یان (گومان) هاتە کایەوە.

ئێستاش ئەم دوو خانەیە شیتەڵ دەکەینەوە بە پێی دەمکات :

١ـ دەمکاتی ڕانەبردوو : لە ئەم دەم کاتەدا خانەکانی (نزیك)، (دوور)، (مەبەست) بۆشن، جا لەبەر ئەوە تەنها خانەی بەردەوامی ڕوخسار گۆڕە لە ڕۆخی ڕستەدا و بەئەم چەشنە :

(ب)

(بەرکار) (ئامراز) (هەڵ) (نە) (دە)(بنج)(ێن)(ر)(—)(—)(—)(—)

ئەم خانەیە بە روخساری (ب) دەردەکەوێت لە هەموو رستەیەکدا کەوا نیاز و گومان هەڵبگرێت. ئەم بارگەیە دەتوانێت لە رستەی لاکۆڵاندا وون ببێت بەڵام لە زمانی نووسیندا، نابێت وون ببێت، وەك :

با ئازاد بەردەکە هەڵ (—) گرێت

یان :

با ئازاد بەردەکە هەڵ (ب) گرێت

کەچی ناتوانین بڵێین :

با ئازاد بەردەکە (—) (—) گرێت

یان :

با ئازاد (—) (—) (ب) ەی، گرێت

ئەم دیاردە هەرەمەکی و دەم دەمی‌یە دەبێت یەکلایی بکرێتەوە و لێرەدا دووبارەی دەکەینەوە کەوا تەنیا دیاردەی ئاوێتە بوون دەتوانێت ئەم روخسارە بخواتەوە لە رستەی (نەرێ)دا.

٢- <u>رێژەی فەرمان</u> : لە رێژەی فەرماندا، خانەکانی (ر)،(نزیك)،

(دوور)،(مەبەست) بۆشن، جا لە بەر ئەوە چی وترا بۆ رانەبردوو، لێرەشدا دەچەسپێت،تەنها بەیەك جیاوازییەك نەبێت.ئەویش بە ئاوێتەی بوونی خانەی (ب) لەگەڵ(نەرێ)دا، روخسارێکی نوێ دەردەکەوێت کەوا جیاکەرەوەی رستەی فەرمانە لە هەموو زمانەکەدا:

لێرەدا لە بەر ئەوەی رستەکە (فەرمان) هەڵدەگرێت بە ئاشکرا، روخساری (دە) هەرگیز دەرناکەوێت. لێرەشدا دەتوانین بیر بگوشین و بڵێین :

بگۆڕی بەردەوامی (ب) لە دەمکاتی رانەبردوودا جیاوازە لە بگۆڕی بەردەوامی (ب) لە دەمکاتی فەرماندا، چونکە هەمان هاوکێشە دوو ئەنجام دەدات ، وەك :

(«نە» بۆ نیاز و گومان)

= (ب) + (نە)

(«مە» بۆ فەرمان)

٣- دەمکاتی رابردوو : لێرەدا هەلویستەکە زۆر ئاڵۆزترە چونکە دوو خانە دەتوانن دیاربن لە ریزی کرداردا ئەویش بگۆڕی دەرەکی (دە) لە رابردووی بەردەوامدا و بگۆڕی ناوەکی (مەبەست) لە هەموو رابردوویەکدا (خشتەی ١٣).

## ٦ـ وەرچەرخانی هێزی رستە :

لە زمانەکەدا کرداری بنجی دووجۆرن لە رووی هێزەوە، کرداری بەهێز (تێپەڕ) وکرداری بێهێز (تێنەپەڕ). دەتوانین ئەو هێزەش ناو بنێین (هێزی بنج) یان (هێزی بنجی). بۆ پێویستی زمان و گوفتار کرداری بنجی بێهێز دەتوانێت وەربچەرخێنێت بۆ تێپەڕ بە یاریدەی (بگۆڕی ناوەکی «ێن»). ئەم دیاردەیە دەشێت ناو بنرێت (وەچەرخانی تێپەڕاندن). لەئەنجامی ئەم وەچەرخانەدا خێزانێکی نوێ لە رێژەکانی کردار پەیدا دەبێت کەوا یەکسانە بە ژمارە لەگەڵ رێژەکانی هەر کردارێکی تێپەڕی بنجی. سەبارەت بەکرداری تێپەڕی بنجی هیچ وەچەرخانێك نییە بەرەو تێنەپەڕ و ئەو خێزانە چاوگە بنجییە ئەو رەفتارە نانوێنن. تا ئێستا باسی دو کرداری بنجی کرا یەکەمیان تێپەڕ (گرتن) دووەمیان تێنەپەڕ (کەوتن)، پاشان وترا کەوا (کەوتن) دەکەوێتە بەر زەبری وەرچەرخان دەبێت بەکرداری وەرچەرخاوی تێپەڕ (کەواندن). هەردوو کرداری تێپەڕ (گرتن) و (کەواندن) وەرچەرخێن بۆ دیوی (بکەر نادیار) یان بۆ دیوی (نادیاری) و ئەو دیاردەیە بریتییە لە (وەرچەرخانی بکەر نادیار). هەر کردارێك کەوتە بەر ئەم وەرچەرخانە هێزەکەشی

دەگۆڕێت لە کرداری بە هێزەوە (تێپەڕ) بەرەو کرداری بێهێز (تێنەپەڕ). ژمارەی ئەو ڕێژانەی کەوا لە وەرچەرخانی بکەر نادیاردا دەردەکەون یەکسانە بە ژمارەی ڕێژەکانی هەر کردارێکی تێنەپەڕی بنجی وەك (کەوتن). تەنها نا هەمواری ئەوەیە کەوا کرداری وەرچەرخاو بە (بکەر نادیار) ڕێژەکانی فەرمان ناتوانێت دروست بکات چونکە فەرمان بەسەر نادیاردا ناکرێت. ئەمە بوو کورتەیەك لەسەر (وەرچەرخانی هێزی کردار)، ئێستاش دەتوانین هەردوو وەرچەرخانەکە بە ئەم چەشنە ئاشکرا بکەین :

یەکەم : وەرچەرخانی تێپەڕاندن : ئەم وەرچەرخانە سەرەتاکەی تێنەپەڕ و ئەنجامەکەی تێپەڕە. بە ئەم پێیە تەنها کرداری بنجی تێنەپەڕ دەگرێتەوە.

دووەم : وەرچەرخانی بکەر نادیار: ئەم وەرچەرخانە سەرەتاکەی تێپەڕە ـ ئەنجامەکەی تێنەپەڕە. بە ئەم پێیە ئەم دیاردەیە کرداری بنجی تێپەڕ و کرداری وەرچەرخاو بە (تێپەڕاندن) دەگرێتەوە.

ئەم دوو دیاردەیە بەر پرسیارن لە گۆڕینی هێزی تێپەڕینی کردار بە پێی ڕێزمان و هیچ کەرستەیەکی تر ناتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت. لە لایەکی ترەوە هەرچی بگۆڕی دەرەکی هەیە، بەتایبەتی پێشگری

کردار، هیچ ناگۆڕێن لە ناوەرۆکی ئەم دوو وەرچەرخانەی کەوا باس کران.سەرەڕای ئەوانەش هەر کردارێکی وەرچەرخاو بۆی هەیە دوو رستەی نیازداری و گومانداری بەرامبەر بە هەر رستەیەکی ئاشکرا ریز بکات. ئێستاش میکانیزمی ئەو دوو جۆرە وەرچەرخانە لەسەر وێنەکانی (١٩، ٢٠، ٢١) پیشان دەدەین. لەوێدا (وەرچەرخانی تێپەڕاندن) بە ژمارە (١) ناو براوە (وەرچەرخانی بکەر نادیار)یش بە ژمارە (٢،٣) ناو براوە. هەر پێچێك لەسەر وێنەکە یان هەر تیرێك لەسەر خشتەکە بریتی‌یە لە دیاردەی وەرچەرخان و هەر تیرێك بۆ لای راست یان هەر پێچێك بۆ سەرەوە بریتی‌یە لە ئاراستەی (تێنەپەڕ ـــ تێپەڕ) و هەر تیرێك بۆ لای چەپ یان هەر پێچێك بۆ خوارەوە بریتی‌یە لە دژ ئاراستە، یان (تێپەڕ ـــ تێنەپەڕ).

ئەمە بوو پانۆرامای (هێزی کردار) و ئەمە بوو پسوولەی هەر دوو بگۆڕی ناوەکی (ێن) و (ر)، ئەمەش بوو سنووری دیاری کراوی رستەی دیار و نادیار. سەرەڕای ئەمانەش، هەر کردارێك وەرچەرخا بۆ (بکەر نادیار) دەچێتە رێبازی هەر کردارێکی بنجی تێنەپەڕ ، یان هەر کردارێك وەرچەرخا بۆ (تێپەڕاندن) دەچێتە سەر رێبازی هەر کردارێکی بنجی تێپەڕ بە رێزمان.

بە ئەم پێیە پێنج رووبار لە رستە دروست دەبن و بەئەم چەشنە، (بڕوانە بۆ وێنەی ١٩ و ٢٠ بۆ بەراوردکردنی میکانیزمەکان) :

- دوو رووباری رەسەن، یەکەمیان رووباری ڕێژەکانی چاوگی بنجی تێپەڕ و ئەوی تریان رووباری چاوگی بنجی تێنەپەڕ.

- یەك رووبار لە رستەی وەرچەرخاو بەرەو تێپەڕ بە (ێن).

- دوو رووبار لە رستەی وەرچەرخاو بەرەو بکەر نادیار، یەکەمیان بنجی تێپەڕی وەرچەرخاو بە (ر)، دووەمیان بنجی تێنەپەڕی وەرچەرخاو بە (ێن) پاشان وەرچەرخاو بە (ر).

ئەم پێنج رووبارە لە رستەی زمانەکە، دوانیان تێپەڕن و سیانیان تێنەپەڕن. بەکورتی ئەگەر هەر منالێکی زمان گرتوو ویستی بارگەی ناخی خۆی بگەیەنێت بە دنیای (دەربڕین) ئەوا پێنج ڕێگای هەیە بۆ دەربڕین لە یەکەم پلەی دەربڕیندا. ئەم پێنج ڕێگایە دەتوانن یەك تەنیا رازێك بگوێزنەوە لە ناخەوە بۆ بەرگوێ و بۆ بەرچاو. بۆ روون کردنەوە دەتوانین سیما زانستی‌یەکانی وێنەی (١٩) دەربخەین :

١- هەر دوو چاوگە بنجی‌یەکە بە دوو هێڵی نەشکاوە دیاری کراون (نووسین : أ ب جـ) یان (سووتان : أ هـ ی).

٢ـ هێڵی (نووسین : أ، ب، جـ) دەچێت بۆ لای راست (تێپەڕ) و هێڵی (سووتان : أ، هـ، ی) دەچێت بۆ لای چەپ (تێنەپەڕ).

٣ـ نووسین و سووتان چونکە هەر بنچین و وەرناچەرخێن و یەلا خانەیین.

٤ـ هێڵی (هـ د : سووتاندن) تەریبە بە هێڵی (أ ب جـ) چونکە تێپەڕە.

٥ـ هێڵی (ب م : نووسران) و هێڵی (و ن : سووتێنران) تەریبن بە هێڵی (أ هـ ی) چونکە تێنەپەڕن.

٦ـ رەگی (سووتێنران) سێ خانەی پڕن چونکە رێچکەکەی لە سێ هێڵ پێك هاتووە و دوو جار وەرچەرخاوە لە خاڵی (هـ، و)دا.

٧ـ رەگی (نووسران) دوو خانەی پڕن چونکە هێڵەکەی لە دوو هێڵ پێك هاتووە و یەك جار وەرچەرخاوە لە خاڵی (ب)دا.

٨ـ رەگی (نووسران) خانەی ناوەندی چۆڵە لەبەر ئەوەی بەرامبەر بە خاڵی (هـ) لە سەر (أ ی) خاڵی وەرچەرخان نییە لەسەر (أ جـ).

٩ـ دوو هێڵ روو دەکەن لە لای راست و دوو چاوگی تێپەڕ هەیە (نووسین، سووتاندن).

١٠ـ سێ هێڵ روودەکەن لەلای چەپ و سێ چاوگی تێنەپەڕ هەیە

(سووتان، نووسران، سووتێنران).

لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەتوانین بڵێین کەوا وێنەی (١٩ و ٢٠) و وێنەی (٢١) باشترین کەرەستەی بیرکارین بۆ وەڵامی پرسیارێك، وەك :

(بنج) + (ین) + (ر) = چی ؟

ئەمە بوو ڕێزمانی «یەکەم دەردووی گوفتار» لە زمانە شیرینەکەدا. ئەمە بوو ئەو پردەی کەوا دەگات بەکیشوەری کۆمپیوتەر.

## ٧ـ ریز گۆڕین لە وەرچەرخانی رستەدا :

دەتوانین سنتاکسی هەر رستەیەك دەربخەین لە پێش و لە پاش وەرچەرخاندا، بەئەم چەشنە :

١ـ وەرچەرخانی تێپەڕاندن :

(دارەکە) (ــ) (ـ) (سووت) (ـ) (ـ) (ا) (ـ)

(من) (دارەکە) (م) (دە) (سووت) (ان) (ـ) (د) (ـ).

٢ـ وەرچەرخانی بکەرنادیار بۆ کرداری تێپەڕێنراو (سووتاندن)

(من) (دارەکە) (م) (دە) (سووت) (ان) (ـ) (د) (ـ)

(دارەکە) (ــ) (دە) (سووت) (ێن) (ر)(ا) (ـ).

٣ـ وەرچەرخانی بکەر نادیار بۆ کردار تێنەپەڕ:

(من) (نامەکە) (م) (دە) (نووس) (ـ) (ـ) (ی) (ـ)

(نامەکە) ( ) (ـ) (دە) (نووس) (ـ) (ر) (ا) (ـ)

لە ئەو شەش رستەیەدا تەنها یەك رستە دووبارە بۆوەتەوە، واتە ژمارەیان دەکات بە پێنج رستە. دوو رستەیان تێپەڕە و سیانیان تێنەپەڕە لە رووی هێزەوە. پاشان دەتوانین رستە تێپەڕەکان بەراورد بکەین لە رووی سینتاکسەوە :

رستە تێپەڕەکان :

١ـ من (نامەکە) (م) (دە) (نووس) (ـ) (ـ) (ـ) (ی) (ـ)

٢ـ من (دارەکە) (م) (دە) (سووت) (ان) (ـ) (د) (ـ)

رستە تێنەپەڕکان :

٣ـ دارەکە (ـ) ـ (دە) (سووت) (ـ) (ـ) (ا) (ـ)

٤- داره‌كه (-) (-) (ده) (سووت) (ێن) (ر) (ا) (-)

٥- نامه‌كه (-) (-) (ده) (نووس) (-) (ر) (ا) (-)

له رسته‌ی تێپه‌ڕه‌كاندا، رسته‌ی (٢) له سه‌ر ئه‌ندازه‌ی رسته‌ی (١) دارێژراوه پاش وه‌رچه‌رخانی رسته (٣) بۆ رسته‌ی تێپه‌ڕ. لێره‌دا ده‌توانین بیر بكوشین و بلێین :

یه‌كه‌م : بكه‌رێكی ده‌ره‌كی داده‌نرێت و ئه‌م بكه‌ره‌ش به پێی ریزمان ده‌توانێت به‌روخساری بكه‌ی جودا و بكه‌ری لكاو ده‌ربكه‌وێت وه‌ك (من) و (م) له رسته‌ی (٢) له سه‌ر ئه‌ندازه‌ی رسته‌ی (١) .

دووه‌م : بكه‌ری رسته‌كه (داره‌كه) له رسته‌ی (٣) دا كه‌وا به دوو روخسار ده‌رده‌كه‌وێت، (داره‌كه) و جێناوی لكاوی كه‌سی كه‌سی له رابردوو دا (نادیار)، ده‌كرێت به به‌كار.

سێیه‌م : ئه‌گه‌ر له رسته‌ی (١) دا به‌ركار (نامه‌كه) كرا به جێناوی لكاو. له رسته‌ی (٢) یش دا بێ‌گومان (داره‌كه) یش ده‌كرێت به ئه‌وه، وه‌ك :

من (-) (ده) (ــ) (م) (نووس) (-) (-) (ی) (-)

من (-) (ده) (ــ) (م) (سووت) (ان) (-) (د) (-)

لێرەدا جێناوی بەرکار نادیارە بۆ کەسی سێیەمی تاك لە رابردووی تێپەر دا، وەك لە هەردوو رستەکەدا دەرکەوت .

چوارەم : جێگۆرکێی بکەری لکاو لە رستەی (٢) دا لە سەر ئەندازەی رستەی (١) پیادە کرا. لە خاڵی سێیەم دا، لە سەر هەمان ئەندازە، جێگۆرکێی بکەری لکاوی (م) بە بازێك جووڵا. لە ئەم هەڵ ومەرجە دا، ئەو راستییە چەسپا کەوا :

(بکەری لکاو پەیوەستە بە بەرکارەوە لە رستەی تێپەری رابردوودا)-لە رستە تێ نەپەرەکان رستەی (٣)، کەوا رستەیەکی بنجییە، بووە بە ئەندازە بۆ رستە ی (٤و٥).

لێرەش دا دەوانین بیر بگوشینەوە دیاری بکەین کەوا :

(تێنەپەڕی بنجی) + بگۆڕی (ر) ← (تێنەپەر).

یان :

(تێنەپەر)+بگۆڕی(ێن)+بگۆڕی(ر) ← (تێنەپەر)

پاش چەسپ بوونی ئە م هاوکێشانە ئەم گۆڕانانە روو دەدەن:

یەکەم : لە سەر ئەندازەی رستەی (٣) کەوا (دارەکە) بکەرە تێیدا، لە رستەی (٤)دا (دارەکە) و لە رستەی (٥)دا (نامەکە)، وەرچەرخان بۆ (بکەر) و ناو نران (جێگری بکەر) چونکە لە پێش وەرچەرخان دا (بەرکار) بوون.

دووەم : جێگری بکەر، وەکو بکەری رەسەن مافی خۆی هەیە بۆ دەرکەوتن بە شێوەیەکی کاتی بە روخساری جوودا، یان بە شێوەیەکی هەمیشەیی بە روخساری لکاو. لە ئەو سێ نموونەیە دا جێناوی لکاو نادیارە چونکە بۆ کەسی سێیەمی تاک داڕێژراون. ئێستاش دەتوانین بکەرەکە لە هەر سێ رستەکەدا بکەین بە (کۆ) بۆ نەهێشتنی روخساری لکاوی جێناوەکە.

٣ـ دارەکانم ( – ) ( – ) (دە) (سووت) (ـ) (ـ) (ا).(ن)

٤ـ دارەکان (– ) ( ـ ) (دە) (سووت) (ێن) (ر) (ا) (ن)

٥ـ نامەکان ( – ) ( ـ ) (دە) (نووس) (–) (ر) (ا) (ن)

